# قەبرچیاتی

## شێوازەکانی قورئانی پیرۆز بۆ ئاگادارکردنەوە لە قەبرپەرستی


ئامادەکردنی

**سامی مصطفی حسن**





«اللَّهُمَّ لا تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَناً يُعْبَدُ، أشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ عَلى قومٍ اتَخَذُوا قُبُورَ أنبيائهِمْ مَسَاجِدَ»

(حديثٌ شريف)

١٤٣٩هـ

﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا﴾

(الجن: ١٨)

## خطبة الحاجة:

إن الحمد لله، نحمده، ونستعينه، و نستغفره، و نعوذ بالله من شرور أنفسنا، و من سيئات أعمالِنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، و أشهد أن محمداً عبده و رسوله.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾[1].

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾[2].

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾[3].

أما بعد:

فإن خير الحديث كتاب الله، و خير الهدي هدي محمد (صلى الله عليه وسلم)، و شر الأمور محدثاتها، و كل محدثةٍ بدعة، و كل بدعةٍ ضلالة، و كل ضلالةٍ في النار.

---

(١) آل عمران: ١٠٢.

(٢) النساء :٢.

(٣) الأحزاب: ٧٠ - ٧١.

( ئەگەر بتپەرستی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە نەفامی بێت، ئەوا ـ هەر لەم ڕوانگەیەوە ـ ڕاستی و ناوەڕۆکی هەموو نەفامییەك بتپەرستییە )

مالك بن نبـي (شروط النهضة ص٣٠)

# پێڕست





## دەست پێك

دووبارەکردنەوەی زانست و زانیاری بەشێکی گرنگی پرۆژەی فێربوونە لە ئیسلامدا[٤]، ئەم نامیلکەیەش دووبارە بڵاوکردنەوەی بەشە بابەتێکە[٥] کە لە لاپەڕەکانی (٥٤ ـ ٧٤ )ی ژمارە(٤)ی گۆڤاری ئەیووبیدا بڵاوکراوەتەوە، بە پێویستمان زانی لەبەر گرنگیەکەی پاش پێداچوونەوە و زیادکردن دووبارە دارشتنەوەی بە شێوازێکی نوێ جارێکی دیکە بڵاوی بکەینەوە، ئەم دووبارە دارشتنەوەیەش چوار خاڵ لە خۆ دەگرێت:

یەکەمیان: زیادەیەکی عەرەبییە بۆ ناوی شێوازەکان تاوەکو ئەوەی زمانی عەرەبیش دەزانێت سوودمەند بێت.

دووەمیان: وەرگێڕانێکی ئایەتەکانە بە پێی تەفسیری (ئاسان) لە پەراوێزەکان، تاوەکو پوختەی مانای ئایەتەکان لای خوێنەر ئاسان بێت.

سێیەمیان: دیارخستنی پەیوەندی نێوان ناونیشانی شێوازەکە و ناوەڕۆکەکەی ـ ئایەتەکان ـ لە کۆتایی شێوازەکە یان لە جێی پێویست تاوەکو ئەم پەیوەندییە وێستگەیەکی هزراندنی ئایەتەکان بێت.

چوارەمیشیان: بە پێویستمان زانی ئەم دووبارە بڵاوکردنەوەیە بە چەند پوختە پێشەکییەك بخەملێنین کە ئەمانەن:

---

(٤) ینظر: صحيح البخاري - كتاب العلم - باب من أعاد الحديث ثلاثاً لِيُفهم عنه.

(٥) بابەتەکە سەبارەت بە هەڤاڵانی ئەشکەوتە لە بەشی یەکەمی لە لاپەڕەکانی (٤٥ - ٩٠) ژمارە (٤)ی گۆڤاری ئەیووبیدا بڵاوکراوەتەوە.

## پێشەکی یەکەم

## مێژووی شیرك لە نێوان بتپەرستی و شەخص پەرستی و قەبرپەرستی دا

پێغەمبەر نوح (علیه السلام) کە یەکەم پێغەمبەرە شەڕی هزری بتپەرستی کردبێ، خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا باسی سەرەتای دروستبوونی بتپەرستی قەومەکەی دەکات کە لە شەخص پەرستییەوە هاتووە دەفەرمێت: ﴿قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا۟ كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَـٰلًا﴾ لەم ئایەتانەدا پەروەردگار باس لە بانگەوازی نوح (علیه السلام) دەکات بۆ قەومەکەی، بەڵام وەڵامی قەومەکەی ئەوە دەبێت کە هانی یەکتر بدەن پەرستنی بتەکانیان بەجێنەیەڵن، کە ئەوانیش (وەد، سواع، یەغوث، یەعوق، نەسر)ن. ابن عباس (رضي الله عنه) لە باسی مێژووی ئەم بتانە دەفەرمێت: ئەمانە (وەد، سواع، یەغوث، یەعوق، نەسر) پیاوچاك بوون، پاش مردنیان شەیتان وەسوەسەی بۆ خەڵکەکەیانی هێناوە، کە لە مەجالیسی وانەگوتنەوەیان وێنەیان دروست بکرێت، تاوەکو لە بیر نەکرێن، ئەم وێنانەش بە تێپەڕبوونی چەندین بەرەباب کراونەتە بت و پەرستراون[٦]. هەمان شت قورئانی پیرۆز کە لە باسی بتەکانی قورەیشدا دەفەرمێت: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّـٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ﴾[٧] ابن عباس

(٦) ینظر: تفسیر هذه الآیات من سورة نوح في (التحریر و التنویر) فقد ذکر العلامة ابن عاشور نبذة مفیدة من تأریخ الوثنیة.

(٧) النجم: ١٩ ـ ٢٠ .

(رضي الله عنه) دەفەرمێت (لات) پیاوێك بوو خواردنی بە حاجیەکان دەبەخشی، دوای مردنی خەڵکانێك گۆڕەکەیانی پەرست[٨]. کەواتە بناغەی بتپەرستی بۆ شەخص پەرستی یان قەبرپەرستی دەگەڕێتەوە، ئەو قەبرپەرستییەی ئەمڕۆ لە زۆر ولاتانی ئیسلامیدا دەبینرێت، هەمان بتپەرستییە کە لە زەمانی نەفامی لە مەککە خۆی پیشاندەدا لە سەدان بتی دەوروبەری کەعبەی پیرۆز. لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بتپەرستی هیچ پەیوەندییەکی بە هونەری پەیکەرتاشی ئەمڕۆمانەوە نییە[٩] ، بەڵکو نەخۆشییەکی خۆ بەکەم زانینیە بەرامبەر دارێك کە پیاو چاکێك لەبنی دانیشتییە یان بەردێك کە ماموستایەك لەسەری دانیشتییە یان قەبری پیاوچاکێك یان وێنە و پەیکەری زانایەك....هتد. تاوەکو ئەم خۆبەکەم زانینە دەگاتە ڕادەیەك کە دارەکە یان بەردەکە یان پەیکەرەکە یان گۆڕەکە بپەرسترێت و عیبادەت بکرێت و تەصەورێك لەناخی عیبادەتکارەکە دروست ببێت کەتەنها لە ڕێگای ئەم بەردە یان ئەم دارە یان ئەم گۆڕە بە خودا دەگات، کە هەمان تەصەوری موشریکەکانی مەککەیە لە نەفامی کەدەیان گوت ئەم پەیکەرانە دەپەرستین تاوەکو لە خودا نزیکمان بکەنەوە: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾[١٠]. و تەنها لە پێناو پاراستنی مرۆڤایەتی لەم

---

(٨) ينظر تفصيل ذلك وتخريجه في (فتح المجيد شرح كتاب التوحيد ص١٤٤،٢٧٤ ط. عبدالقادر اللأرنوؤط)

(٩) بەڵکو پێغەمبەر هەبووە کە کەسانێك کاری پەیکەرتاشیان بۆ کردووە وەك لە پێشەکی شەشەمدا باس دەکەین ـ إن شاء الله ـ . بڕوانە : لاپەرە ٦٠.

(١٠) الزمر: ٣.{ ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە}.

کارە ترسناکە کە کوفر و شیرکە، پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لە دوا ساتەکانی ژیانیدا لە خودا دەپاڕێتەوە کە قەبرەکەی بپارێزرێت و وەکو بت نە پەرسترێت، هەروەها دوعا لەو کەسانەدەکات کە قەبری پێغەمبەرانیان دەپەرستن و دەکەنە مزگەوت : «اللَّهُمَّ لا تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَناً يُعْبَدُ، أشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ عَلى قومٍ اتَخَذُوا قُبُورَ أنبيائهِمْ مَسَاجِدَ»(١١). لەباسیاندا دەفەرمێت: ئەمانەی کە قەبری پێغەمبەرانیان دەکەنە مزگەوت شەڕانگێزترین کەسن لای خودای پەروەردگار « إنَّ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ مَنْ تُدْرِكُهُ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ، وَمَنْ يَتَّخِذُ القُبُورَ مَسَاجِدَ»(١٢)، و نەفرەت لە جولەکە و دیانەکان دەکات کە گۆڕی مردووەکانیان دەکەنە مزگەوت «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ»(١٣) .

هەر لەبەر ئەمەش ناونیشانی (شێوازەکانی قورئانی پیرۆز بۆ ئاگادارکردنەوە لە **قەبرپەرستی** )مان بەباشتر زانی بۆ بابەتەکە لە ناونیشانی: (شێوازەکانی قورئانی پیرۆز بۆ ئاگادارکردنەوە لە **شەخص پەرستی** یان **بتپەرستی**) هەرسێکیشیان هەمان مانانە، وشەی **(قەبرچیاتی)** باشترین وشەیە بۆ پوختکردنەوەی ناونیشانەکە.

****

(١١) أخرجه أحمد (٤٧٥).

(١٢) أخرجه أحمد (٣٨٤٤، ٤١٤٣).

(١٣) متفقٌ عليه .





## پاشکۆیەك بۆ ئەم پێشەکییە

## ڕۆڵی سیاسەت لەکردنەوەی دەرگاکانی قەبر پەرستی

ئەوەی پێویستە کە بۆ ئەم پێشەکییە زیادبکرێت ئەوەیە، کە قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ترسناکی کاری دەسەڵاتداران دەکات، لە کردنەوەی دەرگاکانی قەبرپەرستی، وەك لە سەرهاتەکەی هەڤاڵانی ئەشکەوتدا: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا﴾[١٤] واتە: کاربەدەستان و ئەوانەی بڕیاریان بەدەستە، بڕیاریان سەپاند کە مزگەوتێك لەسەریان ئاوەدانبکەن.

ئەم جورە کارانەش کە کەسانێکی کاربەدەست بە درێژایی مێژوو بۆ مەرامی سیاسی یان بازرگانی دەیکەن و قسەی زانایانیش پشتگوێ دەخەن، بڕیارەکان بۆ ئەم مەرامانە بە بێ مەشورەت دەسەپێنرێن.

یان ئەگەر بۆ مەرامی سیاسی و بازرگانیش نەکرێت، بەڵکو تەنها هۆکارەکەی نەزانین بێت، ئەوا پاش تێپەڕبوونی ڕۆژگار، ئەم جۆرە شوێنانە لە لایەکەوە بۆ مەرامی سیاسی و بازرگانی بەکار دێن، لە لایەکی دیکەوە داروبەردەکەی دەپەرسترێن، وەك ئەمڕۆ دەبینین کە لە چەندین وڵات شوێنی هەڤاڵانی ئەشکەوت هەیە و وەزارەتی گەشت و گوزاری وڵاتەکە بەڕێوەی دەبات! نەزان و نەفامیش بەرد و دارەکانی ماچ دەکەن ...!

با چەند نمونەیەکی مێژوویی لەسەر ئەم ئاماژە قورئانییە وەربگرین:

---

(١٤) الکهف:٢١.

## نمونەی یەکەم

## ئەمەوییەکان و نەوەکانی علی (رضي الله عنه)

پاش قەڵەبالغ بوونی مەدینە و زۆربوونی دانیشتووانی، لەسەردەمی خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك [١٥] بڕیاردرا مزگەوتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە هەرچوارلایەوە فراوانبکرێت، قەبری پیرۆزی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و دوو هەڤاڵەکەی(رضي الله عنهما) بخرێتە ناو مزگەوتەوە، بە بیانوی پێویستی فراوانکردنی مزگەوت، لەبەر زۆری دانیشتووانی مەدینە و مێوانانی مزگەوتەکەی... ئەمە لەکاتێکدا ئەمەویەکان دەیانتوانی سەرپێچی زانایان نەکەن ـ لەوانە دە زانایەکەی مەدینە (الفقهاء العشر)[١٦] ـ و تەنها لە سێ لایەوە مزگەوتەکە

---

(١٥) لەساڵی ٨٦ هـ خەلافەتی وەرگرت و لە ساڵی ٩٦ هـ کوچی دوایی کرد.

(١٦) الفقهاء السبع هم:

*سعيد بن المسيب (ت٩٣ هـ). *عبيدالله بن عبدالله بن عتبة بن مسعود (ت٩٤ هـ).

*عروة بن الزبير بن عوام (ت٩٤ هـ). *القاسم بن محمد بن أبي بكر الصديق (ت١٠٦ هـ).

*أبوبكر بن عبد الرحمن بن هشام المخزومي (ت ٩٤ هـ). *خارجة بن زيد بن ثابت الأنصاري (ت١٠٠ هـ). *سليمان بن يسار مولى ميمونة ( رضي الله عنها) (ت ١٠٠ هـ).

هؤلاء هم الفقهاء السبع يجمعهم هذان البيتان:

إذا قيل من في العلم سبعة أبحر ... روايتهم ليست عن العلم خارجة

فقل هم عبيدالله، عروة، قاسمٌ ... سعيد، أبوبكر، سليمان، خارجة

فكل هؤلاء العلماء و أضف اليهم : *سالم بن عبدالله بن عمر بن الخطاب (ت١٠٦ هـ) *ابو سلمة بن عبدالرحمن بن عوف(ت١٠٤ هـ). *أبان بن عثمان (ت١٠٥ هـ). غلبهم الأمويون على أمرهم و





فراوانبکەن، قەبری پیرۆزی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و دوو هەڤاڵەکەی (رضي الله عنهما) لە دەرەوەی مزگەوتەکە بمێنێت. بەڵام بۆچی بڕیاری خۆیان سەپاند و سەرپێچی زانایانیانکرد ؟!

**وەڵامی یەکەم:** مەشورەتی زانایانیان قەبوول کرد بە دەوردانی قبرەپیرۆزەکان بە سێ دیوار، کە بپارێزرێن لەوەی بەشێکبن لە مزگەوت.

**وەڵامی دووەم:** مەرامێکی سیاسیان هەبوو، ئەویش دوورخستنەوەی ماڵی فاطمة (رضي الله عنها) بوو لە رۆخ مزگەوت، تەنیشت حوجرەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، کە نەوەکانی علي (رضي الله عنه) تییایدا دەژیان، ئەم ماڵە لە تەنیشت مزگەوت پلەو پایەیەکی نەوەکانی علی(رضي الله عنهم)بوو، ئەمەویەکانیش پێیان خۆش نەبوو نەوەکانی علی(رضي الله عنهم) ئەم پلەو پایەیەیان هەبێت، بۆیە تاوەکو نەوەکانی علی(رضي الله عنهم) لە مزگەوت دووربخرێنەوە سەرپێچی زانایانیانکرد و مزگەوتەکەیان لە چوار لاوە فراوانکرد! (١٧) .

---

أدخلوا القبور إلى المسجد، وهذا من شهادات التأريخ لقوله تعالى : ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا﴾!

(١٧) ينظر: القبورية نشأتها و آثارها و موقف العلماء منها (ص٦٩ ـ ٧١ ط. دار ابن الجوزي) تأليف: أحمد بن حسن المعلم. و الجواب عن شبهة الإستدلال بالقبر النبوي على جواز اتخاذ القبور مساجد ص٤٧ ـ ٥٢ للدكتور صالح السندي. و البداية و النهاية (٩\٧٤).





## نمونەی دووەم

## ئەمەوییەکان و ابن الزبير (رضي الله عنهما)

ئەمەوییەکان لە کێشە سیاسیەکانیان لەگەڵ (ابن الزبير)، گرنگی کۆبوونەوەی خەڵکیان بەرچاوگرت لە کاتی حەج و عومرەدا لە دەوری (ابن الزبير)، و بەپێویستیان زانی شتێك بکەن کە خەڵکەکە ڕوویان تێبکات لەشام، بۆ ئەم مەبەستە خەلیفەی ئەمەوی عبد الملك بن مروان (قبة الصخرة)ی ئاواکرد و بە قوماش داپیۆشی، تاوەکو ڕووی خەڵك لە شام بکات، ئەمە لە کاتێکدا(قبة الصخرة) هەرچەندە پێشتر قیبلەی موسڵمانانبووە، بەڵام پاش ڕووکردنیان بۆ(مسجد الحرام) لە نوێژدا هیچ گرنگییەکی ئاینی نەماوە[١٨] ، چونکە ئیسلامەتی ئەمر و نەهی خودای پەروەردگارە، بەم ئەمرو نەهیەش تەنها سلاوکردن و ماچکردن بۆ بەردی ڕەش هاتووە، کە هەروەك عومەر(رضي الله عنه) دەفەرمێت لەبەر ئەم ئەمر و نەهیە ماچی دەکەین، ئەگەرنا بەردە و هیچ زەرەر و قازانجی نییە[١٩] ، بۆیە بەردەکەی لای(مسجد الأقصى) هیچ گرنگییەکی نەبووە، پاش وەرگەڕانی قیبلە بۆ(مسجد الحرام)، هیچ حوکمێکی شەرعی لەسەر نەماوە[٢٠] .

---

(١٨) بڕوانە: ئایەتەکانی (١٤٢ ـ ١٥٠) سورەتی البقرة.

(١٩) عَنْ عُمَرَ أَنَّهُ جَاءَ إِلَى الْحَجَرِ فَقَبَّلَهُ فَقَالَ : (( إِنِّى أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لاَ تَنْفَعُ وَلاَ تَضُرُّ وَلَوْلاَ أَنِّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ )) رواه أبوداود (٣١٩) وغيره

(٢٠) و حديث شد الرحال للمساجد الثلاث ليس فيه الصخرة فمسجد الأقصى ليست على الصخرة.
و أثر عمر في ذلك مشهور في رده على كعب الأحبار مفاده : وَلَمَّا دَخَلَ عُمر ( رضي الله عنه) الْبَيْتَ الْمُقَدَّسَ وَأَرَادَ أَنْ يَبْنِيَ مُصَلًّى لِلْمُسْلِمَيْنِ: قَالَ لِكَعْبٍ؟ أَيْنَ أَبْنِيهِ؟ قَالَ ابْنِهِ خَلْفَ الصَّخْرَةِ.




هەر بۆیەش هیچ ئاوەدانیەکی لەسەر نەکراوە تا زەمانی (عبد الملك)، کە لە پێناو مەرامێکی سیاسی بەردەکە ئاوەدانکرا![21].

ئەمەش مانایەکە لە ماناکانی ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدًا﴾ کە مێژوو دەیسەلمێنێت وەك ئەوەی لە نمونەی یەکەمیشدا باسکرا.

بەڵام خراپەی ئەم مەرامە سیاسیانەی ئەمەویەکان بە ڕادەیەك نەبووە کە قەبرپەرستی دروست ببێت لە چاخەزێرینەکانی ئەم ئومەتەدا، بەڵکو ئەمەویەکان خۆیان ڕێگربوون لەمە، ئەگەر خراپەشیان هەبێت، ئەوا چاکەکان و فتوحاتیان ناهێتە ژمار.

---

قَالَ: خَالَطَتْك يَهُودِيَّةٌ يَا ابْنَ الْيَهُودِيَّةِ، بَلْ أَبْنِيهِ أَمَامَهَا. وَلِهَذَا كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ إذَا دَخَلَ بَيْتَ الْمَقْدِسِ صَلَّى فِي قَبَلَيْهِ وَلَمْ يَذْهَبْ إلَى الصَّخْرَةِ. ينظر: مجموعة الفتاوى(١٥\١٥٣).

(٢١) ينظر: إقتضاء الصراط المستقيم (٢\٣٤٦ ـ ٣٤٧) و مجموعة الفتاوى(١٥\١٥٤)(١٢\٢٧)(١\١٨٩).





## پێشەکی دووەم

## چەند لا پەڕەیەکی دیکەی مێژووی قەبر پەرستی

شیرك یان هاوبەشیدانان بۆ خودا بنچینەکەی بۆ شەخص پەرستی و قەبرپەرستی دەگەڕێتەوە، وەك لە پێشەکی یەکەمدا باس کرا، لەم پێشەکیەشدا لەسەر چەند لاپەڕەیەکی دیکەی مێژووی گەلاندا دەوەستین سەبارەت بەم تاوانە، تاوەکو بەرچاومان زیاتر ڕوون بێت لە ترسناکی ئەم تاوانە و زیاتر ئاگاداربین لە هەنگاوەکانی دروستبوونی...

## لاپەڕەی یەکەم:

## لاپەڕەیەکی مێژووی قەبرپەرستی یونانیەکان (قەبری ئەرسطو)!

قوتابیانی ئەرسطو[٢٢] کە مەسەلەیەکی زانستیی تێنەدەگەیشتن، پەنایان بۆ قەبری ئەرسطو دەبرد لەوی باسی مەسەلەکەیان دەکرد، گرێ ئالوزەکانیان دەکردەوە[٢٣] ئەمەش وەکو دیانەتێك بۆ لای یونانیەکان، کە بڕوایان وابوو گیانی مردو دەتوانێ خێر و شەڕ بە خەڵك بگەیەنێت، بۆ ئەم مەبەستەش نوێژ و قوربانیان بۆ مردوو دەکرد[٢٤]!

---

(٢٢) أرسطو هو تلميذ أفلاطون و المتصدر من بعده، إليه انتهت فلسفة اليونان و هو خاتمة حكمائهم و سيد علمائهم . ينظر ترجمته : إخبار العلماء بأخبار الحكماء للقطفي (١١\٤٠) و عيون الأنباء في طبقات الأطباء لإبن أبي أُصيبعة(ص٨٦ ـ ١٠٧ط. دار مكتبة الحياة ـ بيروت) و الفهرس لإبن نديم ص٣٠٧ و مختصر الدول لإبن العبري ص٥٤ ـ ٥٦ . و تأريخ الفلسفة اليونانية (ص١٤١ ـ ١٤٨ ط. لجنة التأليف و الترجمة) تأليف يوسف كرم.

(٢٣) ينظر: المطالب العالية من العلم الإلهي تأليف فخرالدين الرازي (٢٢٨\٧ ط. دار الكتاب العربي بتحقيق أحمد السقا) وذكر الرازي أنه سمع هذا الخبر، و الخبر في كتاب عيون الأبناء في طبقات الأطباء لإبن أبي أُصيبعة ص٨٩ ناقلاً عن ابن فاتك: (... وَلما توفّي أرسطوطاليس نقل أهل أسطاغيرا رمته بَعْدَمَا بليت وجمعوا عِظَامه وسيروها فِي إِنَاء من نُحَاس وَدَفَنُوهَا فِي الْموضع الْمَعْرُوف بالأرسطوطاليسي وصيروه مجمعا لَهُم يَجْتَمعُونَ فِيهِ للمشاورة فِي جلائل الْأُمُور وَمَا يحزنهم ويستريحون إِلَى قَبره ويسكنون إِلَى عِظَامه فَإِذا صَعب عَلَيْهِم شَيْء من فنون الْعلم وَالْحكمَة آبوا بذلك الْموضع وجلسوا إِلَيْهِ ثمَّ تناظرُوا فِيمَا بَينهم حَتَّى يستنبطوا مَا أشكل عَلَيْهِم وَيصِح لَهُم مَا شجر بَينهم وَكَانُوا يرَوْنَ أَن مجيئهم إِلَى ذَلِك الْموضع الَّذِي فِيهِ عِظَام أرسطوطاليس يذكي عُقُولهمْ ويصحح فكرهم ويلطف أذهانهم....)

(٢٤) ينظر: الفكر الإغريقي تأليف محمد الخطيب(ص٢٨ ـ ٥٢ دار علاء الدين للنشر و التوزيع) و القبورية نشأتها ـ آثارها ـ موقف العلماء منها ص٩٠ ـ ٩١ ط. دار ابن الجوزي تأليف أحمد بن حسن المعلم.

## لاپەڕەی دووەم:

## لاپەڕەیەکی مێژووی قەبرپەرستی نەصارا (قەبری مەسیح ـ علیه السلام ـ!)

مەلیك قسطنطین(٢٥) شاری (بیت لحم)ی لە شوێنی لەدایکبوونی عیسا علیه السلام دروست کرد، (هێلانە)ی دایکی قسطنطینیش ئەو شوێنەی ئاوەدانکرد، کە پێیانوابوو عیسا(علیه السلام) لە وێ لە خاچ دراوە، کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن کلێسای قیامە(٢٦). ئەم کردەوانەش وەکو دەرئەنجامێکی گۆڕانکاری کردنیان بوو لە دینی مسیح علیه السلام لە یەکخوداپەرستییەوە بۆ قەبرپەرستی و شەخصپەرستی(٢٧)، کە ڕووی دیاری ئەم گۆڕانکاریە(٢٨) بە دروستکردنی کلێسا لەسەر گۆڕی پیاوچاکان و وێنەکێشانیان خۆی پیشان دەدات(٢٩).

---

(٢٥) هو قسطنطين الكبير (٢٧٥م ـ ٣٣٧م) أول امبراطور روماني دخل النصرانية. ينظر: ترجمته في الموسوعة العربية العالمية (١٨\١٧٩).

(٢٦) قال ابن كثير في ابداية و النهاية (٢\٥٣٣ ط هجر) : ( ... وَبَنَى الْمَلِكُ قُسْطَنْطِينُ بَيْتَ لَحْمٍ عَلَى مَحَلِّ مَوْلِدِ الْمَسِيحِ، وَبَنَتْ أُمُّهُ هِيلَانَةُ الْقُمَامَةَ، يَعْنِي عَلَى قَبْرِ الْمَصْلُوبِ...)

(٢٧) ينظر: المصدر السابق ٢\٥٣٤ ـ ٥٣٥ و مادة:(نيقية ـ مجاميع ـ) في الموسوعة العالمية (٢٥\٦٢٦).

(٢٨) سەبارەت بە گۆڕانکاری لە (تەورات) و (ئینجل) و مانەوەی بەشێکی زۆری ئەم دوو کتێبە ئاسمانییە بێ دەستکاری بڕوانە (گۆڤاری ئەیووبی ژمارە ٤ لاپەڕە ١٦٨ ـ ١٩٢).

(٢٩) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالْحَبَشَةِ فِيهَا تَصَاوِيرُ ، فَذَكَرَتَا لِلنَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ « إِنَّ أُولَئِكَ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا ، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ ، فَأُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ » متفقٌ عليه.

## لاپەڕەی سێیەم:

### لاپەڕەیەکی مێژووی قەبر پەرستی شیعە (قەبری علی ـ رضي الله عنه ـ!)

شا (عضد الدولة فناخسرو بن بوية) کە لە ساڵی (٣٧٢ك) لە بەغدا مردووە نزیکەی زیاتر لە پێنج ساڵ حوکمی عێراقی کردووە شیعەییێکی کوفر بێژ بوو لەمەدحی خۆیدا دەی گۆت:

عَضُدُ الدَّوْلَةِ وَابنُ رُكْنِهَا ... ملكُ الأَمْلاَكِ غَلاَّبُ القَدَرِ[٣٠]

ئەم شایە قەبری علی (رضي الله عنه) لە نەجەف داهێناو دیاریخست بۆ خەڵك و مزگەوتێکی لەسەر ئاواکرد، لەوێ نەریتەکانی شیعەگەریەتی و یادی عاشورای داهێنا[٣١]. نزیکتریش لە ڕاستی ئەوەیە کە قەبری علی (رضي الله عنه) لە قەصری ئیمارەیە لە کوفە، لەوێ نێژراوە، ئەوەی نەجەف قەبری موغیرەی کوڕی شوعبەیە (رضي الله عنه) و ئەوەی کە ئەم شایە دای هێنا لە نەجەف بەناو قەبری علی(رضي الله عنه) و تا ئێستاش زۆرێك لە شیعەکان حەجی بۆدەکەن، تا پاش مردنی علی(رضي الله عنه) بە سێ سەد ساڵ بوونی نەبووە[٣٢].

---

(٣٠) ذكر ابن كثير في البداية و النهاية (١٥\٤١١، ٤١٣ ط. هجر) هذا البيت مع أبيات أخرى له وذكر: إِنَّهُ مُنْذُ قَالَ: غَلَّابُ الْقَدَرْ، لَمْ يُفْلِحْ بَعْدَهَا. وَذَكَرَ غَيْرُهُ: أَنَّ هَذِهِ الْأَبْيَاتَ آخِرُ مَا أُنْشِدَتْ فِيهِ بَيْنَ يَدَيْهِ ... وَحِينَ أَخَذَتْهُ عِلَّةُ مَوْتِهِ لَمْ يَكُنْ لَهُ كَلَامٌ سِوَى تِلَاوَةِ قَوْلِهِ تَعَالَى ﴿مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ﴾ (الحاقة: ٢٨)!

(٣١) قال عنه الذهبي في السير(١٦\٢٥٠): ( وَكَانَ شِيْعِيّاً جَلداً أظهرَ بِالنَّجفِ قَبْراً زَعَمَ أَنَّهُ قَبْرُ الإِمَامِ عَلِيّ، وَبنَى عَلَيْهِ المَشْهَدَ، وَأَقَامَ شعَارَ الرَّفْضِ، وَمأْتمَ عَاشُورَاءَ، وَالاعتزَالَ ...)

(٣٢) قال شيخ الإسلام ابن تيمية (٥\٣٦٧): (... قَبْرُ عَلِيٍّ ـ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ـ الَّذِي بِبَاطِنِ النَّجَفِ فَإِنَّ الْمَعْرُوفَ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّ عَلِيًّا دُفِنَ بِقَصْرِ الْإِمَارَةِ بِالْكُوفَةِ كَمَا دُفِنَ مُعَاوِيَةُ بِقَصْرِ الْإِمَارَةِ بِالشَّامِ وَدُفِنَ عَمْرٌو بِقَصْرِ الْإِمَارَةِ بِمِصْرَ خَوْفًا عَلَيْهِمْ مِنْ الْخَوَارِجِ أَنْ يَنْبُشُوا قُبُورَهُمْ وَلَكِنْ قِيلَ: إنَّ

## لاپەڕەی چوارەم:

### لاپەڕەیەکی دیکەی مێژووی قەبرپەرستی شیعە (قەبری حسین ـ رضي الله عنه ـ!)

شیعەکان لە سەرچاوەکانی خۆیاندا بۆ ئەوە دەچن کە پاش شەهیدبوونی حسین (رضي الله عنه) هەوڵ دراوە کە قەبرەکەی لە کەربەلاء ئاوەدان بکرێت، بەڵام دەسەڵاتە سیاسیە یەکبەدوای یەکەکانی دەولەت ڕێگرییان لەمە کردووە، تا سەردەمی (المنتصر بن المتوكل العباسى) کە نیشانەیەکی بەرزی وەکو مەنارە بۆ قەبری حوسین (رضي الله عنه) داینا‌وە، تاوەکو شیعەکان پێی بزانن بتوانن سەردانی بکەن، ئەمەش ـ وەکو باسکرا ـ بە پێی سەرچاوەکانی ئەوان[٣٣] ، گریمان ئەگەر ڕاستیش بێت[٣٤] ئەوا

---

الَّذِي بِالنَّجَفِ قَبْرُ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ **وَلَمْ يَكُنْ أَحَدٌ يَذْكُرُ أَنَّهُ قَبْرُ عَلِيٍّ وَلَا يَقْصِدُ أَحَدٌ أَكْثَرَ مِنْ ثَلَثِمِائَةِ سَنَةٍ)** و ينظر: جامع المسائل ـ عزيز شمس ـ (٤\١٥٨) و مجموعة الفتاوى (٢٧\٤٦٥ ـ ٤٦٧) و منهاج السنة (٧\٤٣).

(٣٣) ينظر جمع ذلك و تفصيل في كتاب (القبورية ـ نشأتها ، آثارها ، موقف العلماء منها ـ ص١٢٥ ـ ١٢٩) تأليف أحمد بن حسن المعلم

(٣٤) بڕواکردن بە سەرچاوەکانی شیعە ـ لەو بابەتانەی کە شانازی بە هەوڵەکانیان دەکەن بۆ قەبرپەرستی و خودایەتی ئیمامەکانیان ـ زەحمەتە، چونکە دینداری بە درۆزنی دەکەن بەناوی توقیيە. قال شيخ الإسلام في منهاج السنة (١\٥٩ ـ ٦٣): وَقَدِ اتَّفَقَ أَهْلُ الْعِلْمِ بِالنَّقْلِ، وَالرِّوَايَةِ، وَالْإِسْنَادِ عَلَى أَنَّ الرَّافِضَةَ أَكْذَبُ الطَّوَائِفِ، وَالْكَذِبُ فِيهِمْ قَدِيمٌ، وَلِهَذَا كَانَ أَئِمَّةُ الْإِسْلَامِ يَعْلَمُونَ امْتِيَازَهُمْ بِكَثْرَةِ الْكَذِبِ قَالَ: أَبُو حَاتِمٍ الرَّازِيُّ سَمِعْتُ يُونُسَ بْنَ عَبْدِ الْأَعْلَى يَقُولُ: قَالَ أَشْهَبُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ سُئِلَ مَالِكٌ عَنِ الرَّافِضَةِ، فَقَالَ: لَا تُكَلِّمْهُمْ، وَلَا تَرْوِ عَنْهُمْ، فَإِنَّهُمْ يَكْذِبُونَ، وَقَالَ. أَبُو حَاتِمٍ: حَدَّثَنَا حَرْمَلَةُ قالَ : سَمِعْتُ الشَّافِعِيَّ يَقُولُ: لَمْ أَرَ أَحَدًا أَشْهَدَ بِالزُّورِ مِنَ الرَّافِضَةِ، وَقَالَ. مُؤَمَّلُ بْنُ إِهَابٍ: سَمِعْتُ يَزِيدَ بْنَ هَارُونَ يَقُولُ: يَكْتُبُ عَنْ كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ إِذَا لَمْ يَكُنْ دَاعِيَةً إِلَّا الرَّافِضَةَ، فَإِنَّهُمْ يَكْذِبُونَ، وَقَالَ. مُحَمَّدُ بْنُ سَعِيدٍ الْأَصْبَهَانِيُّ : سَمِعْتُ شَرِيكًا يَقُولُ: أَحْمِلُ الْعِلْمَ عَنْ كُلِّ مَنْ لَقِيتُ إِلَّا الرَّافِضَةَ، فَإِنَّهُمْ يَضَعُونَ الْحَدِيثَ، وَيَتَّخِذُونَهُ دِينًا، ـ وَشَرِيكٌ هَذَا هُوَ شَرِيكُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْقَاضِي، قَاضِي الْكُوفَةِ، مِنْ أَقْرَانِ الثَّوْرِيِّ، وَأَبِي حَنِيفَةَ، وَهُوَ مِنَ الشِّيعَةِ الَّذِي يَقُولُ بِلِسَانِهِ: أَنَا مِنَ

(المنتصر بن المتوكل) لە ساڵی (٢٤٨ك) پاش شەش مانگ و چەند ڕۆژێك لە خەلافەتکردن کۆچی دوایکردووە [٣٥]، و ئەوی کردوویەتی نزیکتر ئەوەیە کە بیناکردن نییە بەمانای پەرستگا وەکو ئەوەی ئێستا دەبینین بەڵکو تەنها دانانی نیشانەیەکی بەرزە بۆ زانینی جێگای قەبرەکە[٣٦] ، کە بەپێی سەرچاوەی شیعە لەساڵی (٢٧٣ك) ڕۆخاوە لە ساڵی (٢٨٤ك) پاش دە ساڵ مەلیکی طبرسطان ئاوەدان و قوبەداری کردووە، پاش ئەویش شا عضد الدولة البويهي لەساڵی(٣٦٩ك)دا سەرلەنوێ خەرجییەکی زۆری لێ کردووە بە نۆژەنکردنەوە و زیادکردنی...هتد [٣٧].

ئەمەی باسکرا لەباسی مێژووی ئاوەدانکردنی قەبری حسین و علي باوکی (رضي الله عنهما) ئەوە دەگەیەنێت کە لەم ئوممەتەدا ئاوەدانکردنی قەبرەکان و دروستکردنی قوبە لە سەریان لە سێ سەردەمە زێڕینەکەی ئەم ئوممەتەدا بوونی نەبووە، ڕێگریی لێکراو بووە، ئەگەر بە هەر بیانوویەکیش قەبرێك ئاوەدانکرابێ کاربەدەستان بە ڕێنمایی زانایان تێکیانداوە [٣٨]. ئەمەش لەبەر ڕاست و دروستی بیرۆباوەڕی یەکخواپەرستی لە دڵاندا، لێرەوەش مانای فەرمودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه

---

الشِّيعَةِ، وَهَذِهِ شَهَادَتُهُ فِيهِمْ ـ، وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: سَمِعْتُ الْأَعْمَشَ يَقُولُ: أَدْرَكْتُ النَّاسَ، وَمَا يُسَمُّونَهُمْ إِلَّا الْكَذَّابِينَ، يَعْنِي أَصْحَابَ الْمُغِيرَةِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ. الْأَعْمَشُ: وَلَا عَلَيْكُمْ أَلَّا تَذْكُرُوا هَذَا، فَإِنِّي لَا آمَنُهُمْ أَنْ يَقُولُوا: إِنَّا أَصَبْنَا الْأَعْمَشَ مَعَ امْرَأَةٍ، وَهَذِهِ آثَارٌ ثَابِتَةٌ رَوَاهَا (أَبُو عَبْدِ اللَّهِ) بْنُ بَطَّةَ فِي (الْإِبَانَةِ الْكُبْرَى.) هُوَ وَغَيْرُهُ...

(٣٥) سير أعلام النبلاء (١٢\٤٥).

(٣٦) القبورية (ص١٥٩ ـ ١٦٣)

(٣٧) المصدر السابق و كتاب تأريخ كربلاء ص١٥٦ ـ ١٧٤ .

(٣٨) قال الشافعي في شرح حديث: (إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ـ صلى الله عليه وسلم ـ نَهَى أَنْ تُبْنَى الْقُبُورُ أَوْ تُجَصَّصَ) : ( وَقَدْ رَأَيْت مِنْ الْوُلَاةِ مَنْ يَهْدِمَ بِمَكَّةَ مَا يُبْنَى فِيهَا فَلَمْ أَرَ الْفُقَهَاءَ يَعِيبُونَ ذَلِكَ )كتاب الأم (٢\٦٣١ ط. دار الوفاء)

وسلم) جوانتر تێدەگەین، كە لە باسی باشترین سەدەكانی ئومەتدا دەفەرمێت: « خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ، ...»[٣٩]. كە لە فەرمودەكەوە و لە واقعی مێژووییەوە، گەورەی تێگەیشتنی ئەم سەردەمانەمان بۆ دەردەكەوێت بۆ قورئان و بیرۆباوەڕی یەكخواپەرستی لە قورئاندا، كە ڕێگربوون لە بڵاوبوونی قەبرپەرستی[٤٠]، و هەر شوێنێكیان فەتح كردبا یەكەم هیممەتیان داخستنی دەرگاكانی قەبرپەرستی بووە، كە لە لاپەڕەی پێنجەمی ئەم پێشەكییەدا باسی دەكەین:

---

(٣٩) متفقٌ عليه. و أشار شيخ الإسلام إلى هذه الحقيقة التأريخية فقال: (...دَعْ خِلَافَةَ بَنِي الْعَبَّاسِ فِي أَوَائِلِهَا وَفِي حَالِ اسْتِقَامَتِهَا فَإِنَّهُمْ حِينَئِذٍ لَمْ يَكُونُوا يُعَظِّمُونَ الْمَشَاهِدَ سَوَاءٌ مِنْهَا مَا كَانَ صِدْقًا أَوْ كَذِبًا كَمَا حَدَثَ فِيمَا بَعْدُ لِأَنَّ الْإِسْلَامَ كَانَ حِينَئِذٍ مَا يَزَالُ فِي قُوَّتِهِ وَعُنْفُوَانِهِ. وَلَمْ يَكُنْ عَلَى عَهْدِ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَتَابِعِيهِمْ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ فِي بِلَادِ الْإِسْلَامِ لَا فِي الْحِجَازِ وَلَا الْيَمَنِ وَلَا الشَّامِ وَلَا الْعِرَاقِ وَلَا مِصْرَ وَلَا خُرَاسَانَ وَلَا الْمَغْرِبِ وَلَمْ يَكُنْ قَدْ أُحْدِثَ مَشْهَدٌ لَا عَلَى قَبْرِ نَبِيٍّ وَلَا صَاحِبٍ وَلَا أَحَدٍ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ وَلَا صَالِحٍ أَصْلًا، بَلْ عَامَّةُ هَذِهِ الْمَشَاهِدِ مُحْدَثَةٌ بَعْدَ ذَلِكَ. وَكَانَ ظُهُورُهَا وَانْتِشَارُهَا حِينَ ضَعُفَتْ خِلَافَةُ بَنِي الْعَبَّاسِ وَتَفَرَّقَتْ الْأُمَّةُ وَكَثُرَ فِيهِمْ الزَّنَادِقَةُ الْمُلَبِّسُونَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ وَفَشَتْ فِيهِمْ كَلِمَةُ أَهْلِ الْبِدَعِ وَذَلِكَ مِنْ دَوْلَةِ الْمُقْتَدِرِ فِي أَوَاخِرِ الْمِائَةِ الثَّالِثَةِ. فَإِنَّهُ إذْ ذَاكَ ظَهَرَتْ الْقَرَامِطَةُ العبيدية القداحية بِأَرْضِ الْمَغْرِبِ. ثُمَّ جَاءُوا بَعْدَ ذَلِكَ إلَى أَرْضِ مِصْرَ. وَيُقَالُ: إنَّهُ حَدَثَ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ: الْمُكُوسُ فِي الْإِسْلَامِ. وَقَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ ظَهَرَ بَنُو بويه. وَكَانَ فِي كَثِيرٍ مِنْهُمْ زَنْدَقَةٌ وَبِدَعٌ قَوِيَّةٌ. وَفِي دَوْلَتِهِمْ قَوِيَ بَنُو عُبَيْدٍ الْقَدَّاحِ بِأَرْضِ مِصْرَ وَفِي دَوْلَتِهِمْ أُظْهِرَ الْمَشْهَدُ الْمَنْسُوبُ إلَى عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِنَاحِيَةِ النَّجَفِ وَإِلَّا فَقَبْلَ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ أَحَدٌ يَقُولُ: إنَّ قَبْرَ عَلِيٍّ هُنَاكَ وَإِنَّمَا دُفِنَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِقَصْرِ الْإِمَارَةِ بِالْكُوفَةِ وَإِنَّمَا ذَكَرُوا أَنَّ بَعْضَهُمْ حَكَى عَنْ الرَّشِيدِ: أَنَّهُ جَاءَ إلَى بُقْعَةٍ هُنَاكَ وَجَعَلَ يَعْتَذِرُ إلَى الْمَدْفُونِ فِيهَا فَقَالُوا: إنَّهُ عَلِيٌّ وَأَنَّهُ اعْتَذَرَ إلَيْهِ مِمَّا فَعَلَ بِوَلَدِهِ فَقَالُوا: هَذَا قَبْرُ عَلِيٍّ وَقَدْ قَالَ قَوْمٌ إنَّهُ قَبْرُ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ وَالْكَلَامُ عَلَيْهِ مَبْسُوطٍ فِي غَيْرِ هَذَا الْمَوْضِعِ...) (مجموعة الفتاوى ٢٧\٤٦٥ ـ ٤٦٧)

(٤٠) ينظر جمع ذلك و تفصيل في كتاب (القبورية ـ نشأتها ، آثارها ، موقف العلماء منها ـ ص١٢٥ ـ ١٢٩) تأليف أحمد بن حسن المعلم .

## لاپەرەی پێنجەم:

### قەبری ( دانیال ـ علیه السلام ) مەوقفی ئیمامی عومەر ( رضي الله عنه ).

کاتێك موسلمانان خوزستان فەتح دەکەن لەشاری سوس ـ یان توستر ـ قەبرێکی کراوەیان دوزییەوە، کە قەبری دانیال پێغەمبەر بوو ـ علیه السلام ـ، خەڵکی شارەکە لە کاتی وشکە ساڵی دەریاندەهێنا داوای بارانبارینیان پێدەکرد! ئەبو موسای ئەشعەری (رضي الله عنه) ئەو کات کە لەگەڵ لەشکری موسڵمانان بووە، نامەیەك بۆ خەلیفە عومەر(رضي الله عنه) بەرێدەکات سەبارەت بە قەبرەکە، ئەویش لە وەڵامیدا رێنماییان دەکات کە جەنازەکە بەجوانی بشورێت و کفن بکرێت و نوێژی لەسەر بکرێت(٤١) و بەشەو لە شوێنێکی نادیار بشاردرێتەوە تاوەکو خەڵکەکە تووشی شرك نەبێت(٤٢)! بەمە پێشینانمان لە سەردەمە زێرینەکاندا رێزیان لە قەبر و جەناز ناوە رێگریشیان کردووە لە پەرستنیان، لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە قەبرپەرستی کەسانێك و ئینکارکردنی کەسانێکی دیکە بە هەڵکەندنی قەبرەکان و فرێدانیان، دوو رووی هەلەن لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامیدا، دوورن لە جوان تێگەیشتنی بیروباوەر و ئادابی ئیسلامی.

---

(٤١) و في تأريخ ابن عساكر (١٦٠\٦٧): أن عمر كتب إلى الأشعري أن اغسله بالسدر وماء الريحان وأن تصلى عليه فإنه نبـي دعا ربه ألا يواريه إلا المسلمون.

(٤٢) قال ابن تيمية (مجموعة الفتاوى ١٢١\٢٧):أَمَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بِتَعْفِيَةِ قَبْرِ دَانْيَالَ لَمَّا ظَهَرَ بتستر فَإِنَّهُ كَتَبَ إلَيْهِ أَبُو مُوسَى يَذْكُرُ أَنَّهُ قَدْ ظَهَرَ قَبْرُ دَانْيَالَ وَأَنَّهُمْ كَانُوا يَسْتَسْقُونَ بِهِ فَكَتَبَ إلَيْهِ عُمَرُ يَأْمُرُهُ أَنْ يَحْفِرَ بِالنَّهَارِ ثَلَاثَةَ عَشَرَ قَبْرًا ثُمَّ يَدْفِنُهُ بِاللَّيْلِ فِي وَاحِدٍ مِنْهَا وَيُعْفِيهِ لِئَلَّا يَفْتَتِنَ بِهِ النَّاسُ.

و جاء في بعض كتب التأريخ و السير أن أبا موسى غسله و كفنه و دفنه و أجرى على قبره نهراً مبالغةً في تعفية أثره حفظاً للناس من الإفتتان بالقبور. ينظر: تأريخ الخميس في أحوال أنفس النفيس(١٧٨\١).





## پێشەكی سێیەم

## سەبارەت بە دوو جۆری شیركی گەورە

## كە دراونەتە پاڵ سوفیگەریەتی بە ناحەق

سوفیگەریەتی قوتابخانەیەكی ئیسلامییە، كە زیاتر بایەخ بە تەزكییەی نەفس دەدات بە بەردەوامی عیبادەتكردن و پشت كردن لە جوانی و سەروەتداری و دەسەڵاتداری دونیا[٤٣]. سەرانی ئەم قوتابخانەیە خۆیان بە پابەندی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەزانن[٤٤].

---

(٤٣) قال ابن خلدون في المقدمة ( تأريخة ١\٦١١): (الفصل السابع عشر في علم التصوّف: هذا العلم من العلوم الشّرعيّة الحادثة في الملّة وأصله أنّ طريقة هؤلاء القوم لم تزل عند سلف الأمّة وكبارها من الصّحابة والتّابعين ومن بعدهم طريقة الحقّ والهداية وأصلها العكوف على العبادة والانقطاع إلى الله تعالى والإعراض عن زخرف الدّنيا وزينتها، والزّهد فيما يقبل عليه الجمهور من لذّة ومال وجاه والانفراد عن الخلق في الخلوة للعبادة وكان ذلك عامّا في الصّحابة والسّلف. فلمّا فشا الإقبال على الدّنيا في القرن الثّاني وما بعده وجنح النّاس إلى مخالطة الدّنيا اختصّ المقبلون على العبادة باسم الصّوفيّة والمتصوّفة)

(٤٤) قال شيخ الإسلام (الإستقامة ٢\١٦٢): (تَجِد الْمَشَايخ الاصحاء من الصُّوفِيَّة يوصون بِالْعلمِ ويأمرون باتباعه كَمَا تَجِد الاصحاء من اهل الْعلم يوصون بِالْعَمَلِ ويأمرون بِهِ لما يخَاف فِي كل طَرِيقَة من ترك مَا يجب من الاخرى). و قال رحمه الله (منهاج السنة ٥\٣٣١ - ٣٣٢) : ((وَلِهَذَا كَانَ مَشَايِخُ الصُّوفِيَّةِ الْعَارِفُونَ أَهْلُ الِاسْتِقَامَةِ يُوصُونَ كَثِيرًا بِمُتَابَعَةِ الْعِلْمِ وَمُتَابَعَةِ الشَّرْعِ، لِأَنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ سَلَكُوا فِي الْعِبَادَةِ لِلَّهِ مُجَرَّدَ مَحَبَّةِ النَّفْسِ وَإِرَادَاتِهَا وَهَوَاهَا، مِنْ غَيْرِ اعْتِصَامٍ بِالْعِلْمِ الَّذِي جَاءَ بِهِ الْكِتَابُ وَالسُّنَّةُ، فَضَلُّوا بِسَبَبِ ذَلِكَ ضَلَالًا يُشْبِهُ ضَلَالَ النَّصَارَى.وَلِهَذَا قَالَ بَعْضُ الشُّيُوخِ وَهُوَ أَبُو عَمْرِو بْنُ نُجَيْدٍ:كُلُّ وَجْدٍ لَا يَشْهَدُ لَهُ الْكِتَابُ وَالسُّنَّةُ فَهُوَ بَاطِلٌ. وَقَالَ سَهْلٌ:كُلُّ عَمَلٍ بِلَا اقْتِدَاءٍ فَهُوَ عَيْشُ النَّفْسِ، وَكُلُّ عَمَلٍ بِاقْتِدَاءٍ فَهُوَ عَذَابٌ عَلَى النَّفْسِ. وَقَالَ أَبُو عُثْمَانَ النَّيْسَابُورِيُّ: مَنْ أَمَّرَ السُّنَّةَ عَلَى نَفْسِهِ قَوْلًا وَفِعْلًا نَطَقَ بِالْحِكْمَةِ، وَمَنْ أَمَّرَ الْهَوَى عَلَى نَفْسِهِ قَوْلًا وَفِعْلًا نَطَقَ بِالْبِدْعَةِ لِأَنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾ (سُورَةُ النُّورِ: ٥٤). وَقَالَ بَعْضُهُمْ: مَا تَرَكَ أَحَدٌ

بەڵام وەکو هەرقوتابخانەیەکی دیکەی ئیسلامی، کەسانێکی خاوەن بیرۆباوەڕی ناپەسەند و دوور لە ئیسلام خۆیان بە هەڵگری ڕێبازی سوفیگەریەتی دەزانن و بیرۆباوەڕە ناپەسەندەکانیان دەدەنەپاڵ سوفیگەریەتی بە ناحەق، لەوانە:

* بیرۆباوەڕی (وحدة الوجود) کە جیاوازی نەکردنە لە نێوان خالق و مخلوق هەمان شیرکی گەورەی یونانیە کۆنەکان و هندوس و بوزیەکانە[(٤٥)] .

* بیرۆباوەڕی قەبرپەرستی (القبورية)[(٤٦)] کە پاڕانەوەیە لە مخلوق تاوەکو بە هانایەوەبێت یان بانگەوازەکەی بە خالق بگەیەنێت، کە هەمان شیرکی کافرەکانی مەککەیە کاتی نەفامی، کەدەیان گوت ئێمە ئەم بتانە دەپەرستین تاوەکو لە خودا نزیکمان بکەنەوە ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾[(٤٧)].

---

شَيْئًا مِنَ السُّنَّةِ إِلَّا لِكِبْرٍ فِي نَفْسِهِ. وَهُوَ كَمَا قَالُوا، فَإِنَّهُ إِذَا لَمْ يَكُنْ مُتَّبِعًا لِلْأَمْرِ الَّذِي جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ كَانَ يَعْمَلُ بِإِرَادَةِ نَفْسِهِ، فَيَكُونُ مُتَّبِعًا لِهَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ، وَهَذَا غَيْشُ النَّفْسِ، وَهُوَ مِنَ الْكِبْرِ، فَإِنَّهُ شُعْبَةٌ مِنْ قَوْلِ الَّذِينَ قَالُوا: ﴿لَنْ نُؤْمِنَ حَتَّى نُؤْتَى مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ﴾(سُورَةُ الْأَنْعَامِ: ١٢٤).)) و للمزيد ينظر: الفتاوى (١٠\٦٩٤ ، ٤١٢)(١١\٦٦٦، ٣٢٠)(١٤\٢٩ ، ٤٦٦) (١٩\٢٧٧) و درء التعارض(٥\٣٤٩) و منهاج السنة (٥\٣٣٩).

(٤٥) ينظر: الهندوسية و تأثر الفرق الإسلامية بها (٢\٦٠٥ - ٦٤٤ ط. دار الأوراق الثقافية) تأليف: أبو بكر محمد زكريا. و البوذية تأريخها و عقائدها و علاقة الصوفية بها (ص ٢٥ ،٤٧٧ ط . أضواء السلف) تأليف: عبدالله نومسك. و الموسوعة الميسرة لندوة الشباب الإسلامي (٢\٧٢٤ - ٧٣١ ، ٧٥٨ - ٧٦٣).

(٤٦) ينظر: كتاب (القبورية ـ نشأتها ، آثارها ، موقف العلماء منها ـ ص١٢٥ ـ ١٢٩) تأليف أحمد بن حسن المعلم) و تعريف القبورية لغة و اصطلاحاً .

(٤٧) الزمر:٣. {...ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە...}





ئەم دوو جۆرە شیرکە (وحدة الوجود، قەبرپەرستی) دەرچوونن لە ئیسلام دژن بۆ بناغەی بیرۆباوەڕی ئیسلامی کە ئاوەدانە لەسەر:

١ ـ جیاوازیکردن لە نێوان خالق و مخلوق.

٢ ـ پێویست نەبونی هیچ واسیتەیەك کە دەنگی مەخلوق بە خالق بگەیەنێت.

هەموو فیرقە و مەزهەبە ئیسلامییەکان لەسەر ئەم دوو خاڵە یەکڕان[٤٨] ، و ئەوانەی بیری (وحدة الوجود) یان هەیە کە دەڵێن هەموو شتێك خودایە یان بیری (حلول) و (إتحاد)یان هەیە کە دەڵێن شێخەکانیان لە پلەی خودایەتین، تێکەڵبوون و یەکگرتنیان هەیە لەگەڵ خودا[٤٩] بەڵام ئەمانە نە لە سەر سوفیگەریەتی حیسابن و نە لە سەر ئیسلام.

بە هەمان شێوە ئەوانەی بۆ ئەوەدەچن کە دەنگ و پاڕانەوەیان بە خالق ناگات ئەگەر لە ڕێگای هاوارکردنیان نەبێت لە و بت و دار و بەرد و قەبر و ...هتد، کە لەلایان پیرۆزن ئەمانەش نە لە سەر سوفیگەریەتی حیسابن و نە لەسەر ئیسلام.

---

(٤٨) ینظر: (المسائل العقدية التي حكى فيها ابن تيمية الإجماع جمعاً و دراسة ص٨٥ - ١٥٤ ، ٣٩٩ - ٤٠٨ ط.دار الفضيلة ) تأليف: خالد الجعيد و علي العلياني و ناصر الجهني.

(٤٩) (يختلف الإتحاد و الحلول عن وحدة الوجود في المقدمة من حيث الإعتراف بوجود ثنائية، هي : العالم أو الكائنات من جانب، و المطلق أو الإله من جانب آخر، إلا إنهما يتفقان معها في النتيجة وهي: أن نتيجة التعدد في الحلول و الإتحاد تصبح واحدة ف-(الكثرة صارت واحدة) و كأنهما شكل أو صورة أخرى لوحدة الوجود. فتتفق المعتقدات الثلاثة في القول بالوحدة و المزج و التسوية بين المطلق(أو الإله عند من يؤمن به) و العالم، كما أنها كلها مفضيةٌ إلى القول بنفي الإله و تأليه البشر) (الثيوصوفيا ص١٤٩ تأليف مريم بنت ماجد بن أديب عنتابي).

جۆری یەکەمی ئەم شیرکە (وحدة الوجود) و خوشك و براکانی لە (الحلول) و (الإتحاد) تەنها تێگەیشتنیان کیفایەتە بۆ زانینی ئەو توڕاهاتەی لە ناوەڕۆکەکەیاندا هەیە(٥٠) بۆیەش لەم بابەتەدا تەنها ئاوڕێك لە جۆری دووەم دەدەینەوە کە قەبرپەرستییە و لە جۆری **شیرکی کافرەکانی مەککەیە**، بە پشتیوانی خودا ـ پاش تەواوبوونی ئەم پێشەکیانە ـ هەوڵدەدەین کە بەڵگەکانی قورئانی پیرۆز بخەینە ڕوو لە سەر پۆچەڵکردنی ئەم هزرە کە خەڵکانێك لە ئەنجامی دووریيان لە قورئان و فەرموودە پێی هەڵخەلەتاوون، بە هیوای گەڕانەوەیان بۆ ڕاستی ئیسلام .

(٥٠) قال شيخ الإسلام(مجموعة الفتاوى ٢\١٣٨): ( أن تصور مذهب هؤلاء كافٍ في بيان فساده ولا يحتاج مع حسن التصور إلى دليلٍ آخر، و إنما تقع الشبهة لأن كثير من الناس لا يفهمون حقيقة قولهم و قصدهم، لما فيه من الألفاظ المجملة و المشتركة، بل هم أيضاً لا يفهمون حقيقة ما يقصدونه و يقولونه، و لهذا يتناقضون كثيراً في قولهم، و إنما يتخيلون شيئاً و يقولونه أو يتبعونه، و لهذا قد افترقوا بينهم على فرق، ولا يهتدون إلى التمييز بين فرقهم، مع إستشعارهم أنهم مفترقون).
للمزيد حول الردود على هذه الأفكار المنحرفة خاصة وحدة الوجود ينظر: (ابن عربي عقيدته و موقف علماء المسلمين منه ص ٥٣ - ٧٣ ط: مكتبة أهل الأثر) تأليف الدكتور دغش بن شبيب العجمي. و ينظر أيضاً: مبحث (الحلولية و وحدة الوجود و الكمونية) من موسوعة اليهود و اليهودية و الصهيونية (١\١٨١ - ١٩٦ الطبعة المفصلة لدار الشروق) عبدالوهاب المسير. هەروها بۆ زیاتر بڕوانە: گۆڤاری ئەیووبی ژمارە(٤) ل١٠٠ - ١١١.

## پێشەکی چوارەم

## دروست تێگەیشتنی ماناکانی وەسیلە و شەفاعەت

پاڕانەوە لە خودا یەکخوداپەرستییە و دژەکەی پاڕانەوەیە لە بێجگەلە خودا کە شیرکی گەورەیە و دەرچوونە لە ئیسلامەتی، ئەم نووسینەش دیارخستنی ئەم ڕاستییەیە بە دەیان بەڵگە لە ئایەتیەکان قورئانی پیرۆز، کە قەبوڵکردنیان تەسلیم بوونە بۆ خودای پەروەردگار و ناوی (إسلام)یش هەر لەم تەسلیمبونەوە هاتووە، وەڕەتکردنیان بە هەواو هەوەس و لێکدانەوەی نابەجێ، ڕەتکردنەوەی ئیسلامە با ڕەتکار نوێژ کەر و ڕۆژووگر بێت یان چاکەکار و حاجیش بێت!

و لەبەرئەوەی هەندێك جار خوازیاری ڕاستی و فێربوون، ماناکانی پاڕانەوە لە بێجگەلە خودا کە شیرکی گەورەیە لەگەڵ ماناکانی وەسیلە و شەفاعەت لێی تێکەڵدەبن، بۆ لادانی ئەم تێکەڵ بوونە و تەنها بۆ ئەو کەسە کە خوازیارە بۆ فێربوون و تێگەیشتنی بیرۆباوەڕی ئیسلامی ئەم پێشەکیە نووسراوە لە دووبەشی کورت و پۆختدا، بەشی یەکەم باسی مانای وەسیلە وە بەشی دووەم باسی مانای شەفاعەت .





## بەشی یەکەم: وەسیلە

وشەی (الوسيلة) دوو جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، یەکەمیان: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[51] واتە: ئەی کۆمەڵی ئیمانداران تەقوادارى خودا بکەن ـ کە دوورکەوتنەوەیە لە هەموو نەهی لێکراوێك ـ و داوای وەسیلە بکەن ـ کە ئەنجامدانی هەموو فەرمانپێکراوێکە ـ ، لەرێی خودادا تێبکۆشن تاوەکو سەرفرازی دونیا و قیامەت بن. ئایەتی دووەمیش: ﴿قُلِ ٱدْعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ۝٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾[52] پەروەردگار بەم دوو ئایەتەی سورەتی ئیسرا بە دوو قوناغ مرۆڤایەتی ئاگادار دەکاتەوە لە تاوانی پاڕانەوە لە بێجگە لەخودا:

---

(٥١) المائدة: ٣٥.{ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکار بن، لە رێگەی هەموو هۆکارو کردەوەیەکی چاکەوە هەوڵ بدەن ڕەزامەندیی ئەو زاتە بەدەست بهێنن، هەمیشە هەوڵ و کۆشش و جیهادو خەبات بکەن لە پێناوی ڕێباز و بەرنامەی ئەو زاتەدا، بۆ ئەوەی سەرفراز بن (لە هەردوو جیهاندا).}

(٥٢) الإسراء: ٥٦ - ٥٧. { ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هاوەڵگەران بڵێ: ئادەی هاناو هاوار بکەن لەو بت و شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن (ئایا هیچیان لە دەست دێت؟ دڵنیابن کە ئەوانە) نە دەتوانن بەڵاو ناخۆشیەکتان لەسەر لابەرن. نەدەتوانن بارودۆخ بگۆڕن.* ئا ئەوانەی کە ئەوان هاناو هاواریان لێ دەکەن، کامیان لە خوا نزیکترە؟! لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان هاوار لە خوا دەکەن و داوای نزیك





**یەكەمیان:** پەروەردگار ئینكار لەوانە دەكات كە لە بێجگەلەخودا دەپاڕێنەوە و پێیان ڕادەگەیەنێت كە ئەمانە ناتوانن بتانپارێزن لە كاری نەخوازراو كە بۆتان هات و ناتوانن خراپە لە سەرتان لادەن.

**دووەمیان:** پەروردگار باس لە كەسانێكی موشریك دەكات كە جنوكەیان دەپەرست و هاناو هاواریان بۆ جنوكە دەبرد، ئەمە لە كاتێكدا ئەم جنوكانە مۆسڵمان ببوون داوای نزیكبوونەوەیان لە خودا دەكرد بە هێنانەدی فەرمانپێكراوەكانی و دووركەوتنەوە لە نەهیلێكراوەكانی بەهیوای ڕەحمەتی خودا و ترسی سزاكەی كە سزایێكی ئاگادار لێكراوە كە دووزەخە، لە پاشان پەروەردگار پرسیار لە خەڵكان دەكات: كامیان ڕاسترن ئەوانەی لەخودا دەپاڕێنەوە وەسیلەی شەرعی دەگرنەبەر بە هێنانەدی فەرمانپێكراوەكانی و دووركەوتنەوە لە نەهیلێكراوەكانی بەهیوای ڕەحمەتی خودا و ترسی سزاكەی یان ئەوانەی لە جنوكە دەپاڕێنەوە؟

ئەمە هۆكاری دابەزینی(سبب نزول)ی ئایەتەكەیە ـ وەك ابن مسعود (رضي الله عنه) بۆمان دەگێڕێتەوە[٥٣] ـ بەهۆی هۆكاری دابەزینیش مانای ئایەتەكە بەجوانی بۆمان دەردەكەوێت. عیبرەتیش لە گشتی ماناكەیەتی نەك تایبەتی هۆكاری دابەزین بۆیەش ماناكانی جنوكەپەرستی لە ئایەتەكە كە ابن مسعود (رضي الله عنه) بۆمان

---

بوونەوە لە پەروەردگاریان دەخوازن و چاوەڕوانی ڕەحمەتی دەكەن، لە سزاو تۆڵەشی دەترسن، بەڕاستی سزای پەروەردگارت مەترسی لێكراوە.}

(٥٣) الإستعاب في بيان الأسباب (٢\٤٤١) و ينظر: صحيح مسلم(٣٠٣٠) و صحيح البخاري (٤٧١٤، ٤٧١٥).

دەگێڕێتەوە، هەمان ماناى پەرستنى قەومى (نوح)ە ـ عليه السلام ـ بۆ (وەد، سواع، يەغوث، يەعوق، نەسر) كە لە پێشەكى يەكەمدا ابن عباس (رضي الله عنه) بۆمانى گێڕاوەتەوە، ئەمانە ماناى بتپەرستين و بە درێژايى مێژووى مرۆڤايەتى ئەم مانايانەى بتپەرستى بەشێوەى جۆراوجۆر دووبارەدەبنەوە، جەنگى نێوان بتپەرستى و يەكخوداپەرستى لە زەمانى نوح عليه السلام دەستى پێكردووە و هەر بەردەواميش دەبێت.

ئەوەى شايەنە كە بگوترێت و پۆختە بكرێت لەكۆتايى باسى ئەم دوو ئايەتە كە وشەى (الوسيله)يان تێدايە، ئەوەيە كە ماناى (الوسيله) **نزيكبوونەوەيە** لە خودا بە ڕێگاى شەرعى واتە ئەنجامدانى ئەو كاروكردەوانەى پەروەردگار فەرمانى پێكردووە و دووركەوتنەوە لەو كاروكردەوانەى پەروەردگار نەهى لێكردووە، بەهيواى دووركەوتنەوە لەسزاى خودا و نزيكبوونەوە لە پاداشتەكەى، بەوپەڕى **پەرۆشييەوە**، ئەمەش هەمان ماناى (الوسيلة) لە سەرچاوەكانى زمانى عەرەبيدا: هەروەك ڕاغبى ئەصفەهانى لە (المفردات في غريب القرآن)[٥٤] دەفەرمێت: «الوَسِيلَةُ: التّوصّل إلى الشيء برغبة وهي أخصّ من الوصيلة، لتضمّنها لمعنى الرّغبة. قال تعالى: ﴿وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ﴾ وحقيقةُ الوَسِيلَةِ إلى الله تعالى: مراعاة سبيله بالعلم والعبادة، وتحرّي مكارم الشّريعة، وهي كالقربة، والوَاسِلُ: الرّاغب إلى الله تعالى» لێرەوە ماناى (الوسيلة) بۆمان ڕووندەبێتەوە، ئەوانەى دەڵێن پاڕانەوەمان لە پياوچاكان و گۆڕەكانيان بۆ ئەوەيە لە خودا نزيكمانبكەنەوە و (وەسيله)يە بۆ گەيشتن بەخودا و بە

(٥٤) (ص٨٧١) مادة: وسل. و ينظر: مادة (و س ل) في غيرها من المعاجم.





بێ واسیتە بە خودا ناگەین، ئەمانە بە ناحەق مانای قورئانیەکەی وەسیلە لێکدەدەنەوە و هەمان گوتنەکەی کافرەکانی مەککە دووبارەدەکەنەوە کە دەیانگوت: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾ [٥٥] واتە: دەیان پەرستین تاوەکو لە خودا نزیکمان بکەنەوە. ئەم دوو لێکدانەوە جیاوازە بریتییە لە جیاوازی نێوان بتپەرستی و خوداپەرستی پێویستە موسڵمان لێی ئاگادار بێت بەیانی و ئێواران بڵێت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لَا أَعْلَمُ) [٥٦] .

هەروەها پێویستە موسڵمان ئاگادار بێت لە هەڵەی تەسکردنەوەی مانای وەسیلە کە باسی دەکەین:

---

(٥٥) الزمر:٣. {ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە.}

(٥٦) أخرجه البخاري في الأدب المفرد(٧١٦) و تمامه: عن مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، لَلشِّرْكُ فِيكُمْ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ» فَقَالَ أَبو بَكْرٍ: وَهَلِ الشِّرْكُ إِلَّا مَنْ جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَلشِّرْكُ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ، أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى شَيْءٍ إِذَا قُلْتَهُ ذَهَبَ عَنْكَ قَلِيلُهُ وَكَثِيرُهُ؟» قَالَ: قُلِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لَا أَعْلَمُ».





## تەسککردنی مانای وەسیلە بە شێوازێکی تایبەتی پاڕانەوەوە

بۆ زیاتر ئاشنابوون لەگەڵ ماناکانی (الوسیلە) پێویستە بزانین کە زۆر لە خەڵکان مانای وەسیلە تایبەت دەکەن بە مانای (خاترگرتن و ڕێزلێنان) بۆ نمونە دەڵێن: خودایە بۆ خاتری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) یان بۆ خاتری قورئانی پیرۆز یان بۆ خاتری فلانە پیاو چاك بەهشتمان پێببەخشی...هتد، گشت ماناکانی (وسیلە) لەم شێوازەی پاڕانەوەدا کۆدەکەنەوە.

لە پێناو ڕوونکردنەوەی ئەم تەسککردنەوەیە بۆ مانای وەسیلە، پێویستە بزانین کە هەرچەندە ئەمە تەسککردنی مانای وەسیلەیە و لە قورئاندا ماناکەی فراوانترە وەکو باسکرا ـ لە ڕاڤەی دوو ئایەتەکەی ئیسرا و مائیدەدا ـ ، بەڵام لە هەمانکاتدا پێویستە بزانین کە مشتومڕ لەسەر ئەم شێوازە **لە بابەتی بتپەرستی و یەکخوداپەرستیدا نییە چونکە ئەصلی دوعایەکە لە خودا دەکرێت بۆیەش زیاتر لە بابەتە فیقهیەکان نزیکە** کە پێویستە موسڵمان لە بەڵگەکانی بگەڕێت تاوەکو چۆنیەتی پاڕانەوەکەی لەخودا بە پێی بەڵگەی قورئانی پیرۆز و سوننەت بێت، شێوازێکی دوعاکردن بۆ خۆی دانەهێنێت کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەدا نەهاتبێت، چونکە ئاینی ئیسلام کاملە ئێمە ناتوانین چۆنیەتی نوێ بۆ دینداری زیاد و کەم بکەین:﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾(٥٧).

بە بەدواداچوونی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)، سێ چۆنیەتی تەوەسولی شەرعی تایبەت بە دووعاکردن دێنە بەرچاومان کە ئەمانەن:

---

(٥٧) المائدة: ٣. {ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان}




یەکەم: تەوەسول بە ناو و سیفەتەکانی خودای پەروەردگار.

بۆ نمونە بڵێیت: خودایە بۆ خاتری لێبوردەیی خۆت یان ڕەحمەتی خۆت لێم ببورە یان بڵێیت: خودایە تۆ (ڕەزاق)ی هەژاریم لێ دووربخە، تۆ (ڕەحمان)ی بۆ چاکەکاری ڕێنمایم بکە....

**بەڵگە لە قورئانی پیرۆز:**

* ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ﴾ (٥٨)

* ﴿وَقَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَدۡخِلۡنِي بِرَحۡمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ (٥٩)

**بەڵگە لە فەرمودە:**

* ((اللهُمَّ بِعِلْمِكَ الْغَيْبِ، وَقُدْرَتِكَ عَلَى الْخَلْقِ، أَحْيِنِي مَا عَلِمْتَ الْحَيَاةَ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي)) (٦٠)

---

(٥٨) الأعراف:١٨٠.{هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دۆعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن }

(٥٩) النمل: ١٩.{ پەروەردگارا، یارمەتیم بدە دڵ و دەروون و ڕۆح وگیانم کۆبکەرەوە، تا سوپاسگوزاری نازو نیعمەتەکانت بم کە بەسەر من و دایک وباوکمدا ڕژاندووتە، هەروەها کۆمەکیم بکە تا کاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی ڕازیی بیت و بە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانتەوە.}

(٦٠) أخرجه أحمد (٣٠\٢٦٥) واتە: {خودایە لە پێناو ئەوەی کە غەیب دەزانی، لەنەبوونەوە دروستکردنی بونەوەر دەتوانی، بم ژێنە ئەوندەی دەزانی کە ژیانم خێردارە، گەر مردنیشم خێردار بێت بم مرێنە}.

* دوعای لادانی خەموکی: (( اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أَمَتِكَ نَاصِيَتِي بِيَدِكَ مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي وَنُورَ صَدْرِي وَجِلَاءَ حُزْنِي وَذَهَابَ هَمِّي ))[٦١]. بەم مانایانە ئایەت و فەرموودەی زۆر هاتوون لێرە جێ درێژە پێدانیان نییە.

---

(٦١) أخرجه أحمد و غيره و صححه الحاكم في مستدركه(١\٥٠٩) والألباني في الصحيحة(١٩٩). واتە: (خودایە من بەندەی تۆم بە دایك و باوکەوە، ناوچەوانم بەدەست تۆیە، حوکمی تۆ سەپاوە بەسەرمدا ، قەزای تۆ دادپەروەرییە بەسەرمدا ، داواکاریت لێدەکەم بە هەموو ئەو ناوانەی کە هەتن و خۆتت پێ ناوناوە، یان لە کیتابەکانتدا نێنراوە، یان بە کەسێکت پیشانداوە، یان تەنها خۆت دەیانزانی و لە زانستی غەیبن لای تۆ، ـ خودایە بەم هەموو ناوانە داواکاریت لێدەکەم ـ کە قورئانی پیرۆز بکەیتە بوهاری دڵم، و ڕوناکی سینەم و خەم و پەژاریم پێ لادەی).

دووەم: تەوەسول بەکردەوەی چاکە .

بۆ نمونە بلێیت: خودایە ئەم چاکەیەم لە ڕێی تۆدا کردووە پیلانی پیلانگێڕان لێم دوور بخە، یان خودایە بۆ خاتری تۆ چاووم لە حەرام پاراستوە لە چاوحەسودی چاوپیسان بمپارێزە...هتد.

**بەڵگە لە قورئانی پیرۆز:**

* ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ (٦٢)

* ﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ (٦٣)

---

(٦٢) آل عمران: ١٦.{ ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا، بەڕاستی ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە، دە لە گوناهەکانمان خۆش ببە و لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.}

(٦٣) آل عمران: ٥٣.{(ئەوسا وتیان): پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەوەی داتبەزاندووە و ڕەوانەت کردووە، شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشتین، دە تۆیش لە ڕیزی شایەتەکانی (گەیاندنی بەرنامەکەتدا) تۆمارمان بکە.}





* ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ١٩٣ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ (٦٤)

* ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ (٦٥)

* ﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهٗاۖ وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ

---

(٦٤) آل عمران: ١٩٣ - ١٩٤. { پەروەردگارا؛ بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێک بوو، بانگی کردین بۆ ئیمان و (دەیفەرموو): ئیمان بهێنن بە پەروەردگارتان جا ئێمەش (بێ دوودڵی)، خێرا باوەڕمان هێناو (وتمان): پەروەدگارا؛ دەتۆش لەگوناهو هەڵەکانمان خۆش ببە، چاوپۆشی بکە لەکردارە ناپەسەندەکانمان و (لەسەر ڕێبازی) چاکان و (بەختەوەران) بمانمرێنە و لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە. * پەروەردگارا؛ ئەو بەڵێنانەشمان بۆ ئەنجام بدە کە لەسەر زاری پێغەمبەرانتدا بەئێمەت داوە (کە سەرکەوتنە لە دنیاداو بەهەشتی بەرینە لە داهاتوودا) و لە ڕۆژی قیامەتیشدا خەجاڵەت و ڕوو زەردمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن شکێن نیت و بەڵێنی خۆت دەبەیتە سەر.}.

(٦٥) المؤمنون: ١٠٩ . {چونکە بە ڕاستی کاتی خۆی دەستەیەك لە بەندە ئیماندارەکانم دەیانوت؛ پەروەردگارا ئێمە ئیمان و باوەڕی دامەزراومان بە زاتی تۆ هێناوە، دە، لێمان خۆش ببەو ڕەحممان پێ بکە چونکە تۆ چاکترین زاتێکی کە لە هەموو خاوەن ڕەحم و سۆزەکان میهرەبانتریت.}.

أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ (٦٦)

**بەڵگە لە فەرموودە:**

* لە بەڵگەکانی فەرمودەش سەرهاتی ئەو سێ کەسەی کە دەرگای ئەشکەوتیان بەسەردا داخرابوو، کە هەریەکەیان بە باشترین کردەوەکانی خۆی لە خودا پاڕایەوە و خودای پەروەردگار ڕزگاری کردن(٦٧).

---

(٦٦) الأحقاف: ١٥ . { ئێمە فەرمانمان بەئادەمیزاد داوەکە چاکەکارو چاک ڕەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوکیدا، دایکی بەئازارەوە هەڵی گرتووەو بەدەم ئێش و ئازارەوەبوویەتی، سک پربوون و لەشیر برینەوەی سی دانە مانگی خایاندوون .. هەتا کاتێک ئینسان دەگاتە حاڵەتی توندوتۆڵی و توانایی و تەمەنی چڵ ساڵی ( ئەوسا ئیتر حەق وایە ئەم دۆعایە بکاتەیەکێک لەوێردەکانی سەر زاری و ) بڵێت : پەروەردگار !! کۆمەکیم بکەو یارمەتیم بدەتا شوکرانەبژێر و سوپاسگوزاری ئەو نازو نیعمەتانە بم کەبەمن و دایک و باوکمت بەخشیوە، هەروەها یارمەتیم بدەلەو جۆرە کاروکردەوەچاکانەئەنجام بدەم،کەتۆ پێی ڕازیت، داواکاریشم چاکەبڕوێنیت لەناو نەوەکانمدا لەبەر قازانجی خۆم ( چاکەی هەرکەس بەشی دایک و باوکی تیادایە}. بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ، تا لەگوناهەکانم خۆش ببیت و من لەموسڵمانانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارم } .

(٦٧) متفقٌ عليه عَنِ ابْنِ عُمَرَ - رضى الله عنهما - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ « بَيْنَمَا ثَلاَثَةُ نَفَرٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ يَمْشُونَ إِذْ أَصَابَهُمْ مَطَرٌ ، فَأَوَوْا إِلَى غَارٍ ، فَانْطَبَقَ عَلَيْهِمْ ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ إِنَّهُ وَاللَّهِ يَا هَؤُلاَءِ لاَ يُنْجِيكُمْ إِلاَّ الصِّدْقُ ، فَلْيَدْعُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْكُمْ بِمَا يَعْلَمُ أَنَّهُ قَدْ صَدَقَ فِيهِ . فَقَالَ وَاحِدٌ مِنْهُمُ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّهُ كَانَ لِي أَجِيرٌ عَمِلَ لِي عَلَى فَرَقٍ مِنْ أَرُزٍّ، فَذَهَبَ وَتَرَكَهُ ، وَأَنِّي عَمَدْتُ إِلَى ذَلِكَ الْفَرَقِ فَزَرَعْتُهُ ، فَصَارَ مِنْ أَمْرِهِ أَنِّي اشْتَرَيْتُ مِنْهُ بَقَرًا ، وَأَنَّهُ أَتَانِي يَطْلُبُ أَجْرَهُ فَقُلْتُ اعْمِدْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ . فَسُقْهَا ، فَقَالَ لِي إِنَّمَا لِي عِنْدَكَ فَرَقٌ مِنْ أَرُزٍّ. فَقُلْتُ لَهُ

ئەم دوو چۆنیەتییەی تەوەسل بنەمای فێرکردنی موسڵمانن بۆ دوعاکردن و تەحقیقکردنی بەندایەتی و ملکەچی لە ڕێگای خودای پەروەردگار، کە فاتیحە ئاماژەیان بۆ دەکات ، هەروەك لە وێستگەی حەڤدەمی هزراندنی سۆرەتی فاتیحەدا لە ژمارەی یەکەمی گۆڤاری ئەیوبی باسمانکرد لە ژێر ناونیشانی: (فاتیحە مرۆڤ فێری (توسل)ی شەرعی دەکات لە دوعاکردندا)[٦٨]. بەلام لە بەر گرنگییەکەی لێرەدا دووبارەی دەکەینەوە:

## ئاماژەکردنی سورەتی فاتیحە بۆ ئەم دوو جۆرەی تەوەسل:

(تەوەسل ـ خاترـ )ی شەرعی کە دوو شێوەیە، ناوەڕۆکی سۆرەتی فاتیحە ئاماژەی بۆ کردووە:

---

اعْمِدْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ فَإِنَّهَا مِنْ ذَلِكَ الْفَرَقِ ، فَسَاقَهَا ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ مِنْ خَشْيَتِكَ ، فَفَرِّجْ عَنَّا . فَانْسَاحَتْ عَنْهُمُ الصَّخْرَةُ . فَقَالَ الآخَرُ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّهُ كَانَ لِي أَبَوَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ ، فَكُنْتُ آتِيهِمَا كُلَّ لَيْلَةٍ بِلَبَنِ غَنَمٍ لِي ، فَأَبْطَأْتُ عَلَيْهِمَا لَيْلَةً فَجِئْتُ وَقَدْ رَقَدَا وَأَهْلِي وَعِيَالِي يَتَضَاغَوْنَ مِنَ الْجُوعِ ، فَكُنْتُ لاَ أَسْقِيهِمْ حَتَّى يَشْرَبَ أَبَوَاىَ ، فَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَهُمَا ، وَكَرِهْتُ أَنْ أَدَعَهُمَا ، فَيَسْتَكِنَّا لِشَرْبَتِهِمَا ، فَلَمْ أَزَلْ أَنْتَظِرُ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ مِنْ خَشْيَتِكَ ، فَفَرِّجْ عَنَّا . فَانْسَاحَتْ عَنْهُمُ الصَّخْرَةُ ، حَتَّى نَظَرُوا إِلَى السَّمَاءِ . فَقَالَ الآخَرُ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّهُ كَانَ لِي ابْنَةُ عَمٍّ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ ، وَأَنِّي رَاوَدْتُهَا عَنْ نَفْسِهَا فَأَبَتْ إِلاَّ أَنْ آتِيَهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ ، فَطَلَبْتُهَا حَتَّى قَدَرْتُ ، فَأَتَيْتُهَا بِهَا فَدَفَعْتُهَا إِلَيْهَا ، فَأَمْكَنَتْنِي مِنْ نَفْسِهَا ، فَلَمَّا قَعَدْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا ، فَقَالَتِ اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَفُضَّ الْخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ . فَقُمْتُ وَتَرَكْتُ الْمِائَةَ دِينَارٍ ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ مِنْ خَشْيَتِكَ فَفَرِّجْ عَنَّا . فَفَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُمْ فَخَرَجُوا » و ينظر: مختصر البخاري لشيخ ناصر (٢\٨٦ - ٨٨).

(٦٨) بڕوانە: گۆڤاری ئەیووبی ژمارە(١) لاپەرە(٤٢ - ٤٣).

* شێوەی یەکەم: (التوسل بالعمل الصالح) واتە: مرۆڤ لە خودا بپاڕێتەوە بەو کردەوە چاکانەی کە بۆ خودای پەروەردگار کردوویەتی، ئەمەش بەم شێوەیە لە فاتیحەدا خۆی دەنوێنێ:

(خودایە چونکە ئێمە تەنها سوپاسگوزاری(حمد)ی تۆ دەکەین ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، و چونکە تەنها تۆ دەپەرستین ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾، و چونکە تەنها پشت بە تۆ دەبەستین ﴿إِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾، لەبەر ئەم هەموو کردەوانە کە لە ڕێگای تۆدا دەکەین: ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ ڕێگای ئەوانەی زانستی بەسوود و کردەوەی چاکت پێ بەخشیون ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾، وە دوورمان بخە لە ڕێگای ئەوانەی چاکە دەزانن، وە کردەوەی چاکە ناکەن کە لێیان تووڕەی ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾، یان بەبێ زانست خوداپەرستی دەکەن کە گۆمڕاون ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾).

* شێوەی دووەم: (التوسل بأسماء الله وصفاته ) واتە: تەوەسول بە ناوە جوانەکانی خوداو سیفەتە پاکەکانی، کە بەم شێوەیە لە فاتیحەدا خۆی دەنوێنێ:

(خودایە بۆ خاتری ئەوەی کە تۆ پەروەردگاری جیهانی ﴿رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، وە خاوەن ڕەحمەتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، وە پاداشت و سزا لە ڕۆژی دواییدا تەنها بەدەست تووەیە ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾، لە بەر خاتری ئەوەی ئەم هەموو سیفەتە پاك و بەرزانەت هەیە بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنماییمان بکە ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾...) .




سێیەم: تەوەسل بە دووعای پیاوچاکێك کە لە ژیاندا بێت.

بۆ نمونە: لە تەنگانەدا داوا لە کەسێکی ئەهلی تەقوابکەی دوعا بکات، کە خودای پەروەردگار تەنگانەکە لەسەرمان لا ببات.

**بەڵگە لە قورئانی پیرۆز:**

* ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْاْ رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ۝٥﴾ (٦٩).

* ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ۝٦٤﴾ (٧٠) .

**بەڵگە لە فەرمووده:**

داواکاری موسلمانێك لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دوعای باران بارینیان بۆ بکات(٧١) ئەمەش تەوەسولە بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێك لە ژیاندا

---

(٦٩) المنافقون : ٥ . {کاتێك پێیان بوترێت وەرن پێغەمبەری خوا، داوای لێخۆشبوونتا بۆ دەکات، سەر بادەدەن و لووت بەرزی دەکەن، دەیانبینیت ڕوو وەردەگێڕن و بەرهەڵستی دەکەن، لەکاتێکدا ئەوانە خۆیان لا گەورە دەبێت و خۆ بەزلزانن.}

(٧٠) النساء: ٦٤ . { هیچ فرستادەیەکمان نەناردوە مەگەر تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکرێت بەفەرمانی خوا، خۆ ئەگەر ئەو خەڵکە بەڕاستی کاتێک ستەمیان لە خۆیان کرد (بە لادان لە شەریعەت) بهاتنایە بۆ لای تۆ و داوای لێخۆشبوونیان لە خوای گەورە بکردایە، پێغەمبەریش داوای لێخۆشبوونی بۆ بکردنایە، ئەوە بێگومان ئەو کاتە دەیانزانی کە خوا تەوبە و پەشیمانی وەرگرەو میهرەبان و دلۆڤانە (ئەگەر بەڕاستیان بوایە)}.





بوو ، یان داواکاری ئیمامی عُمَر(رضي الله عنه) لە عەباسی مامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دوعای باران بارینیان بۆ بکات[٧٢] ئەمەش تەوەسولە بە عەباسی مامی پێغەمبەر(رضي الله عنه) پاش مردنی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم). ئەمە لە کاتێکدا قەبری پیرۆزی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) لە وێ بوو، بەڵام عومەر(رضي الله عنه) تەوەسولی پێنەکردوە، بەڵکو تەوەسولی بە مامەکەی کرد کە دوعای باران بارینیان بۆ بکات و فەرمووی: (اللهمَّ إنا كنَّا نتوسلُ إليكَ بنبيِّنا صلى الله عليه وسلم فتَسقِينا، وإنا نتَوسلُ إليكَ بعمِّ نبيِّنا فاسْقِنا؟ قالَ: فيُسقَوْنَ)[٧٣].

پوختەی ئەمەی باسکرا ئەوەیە کە ئەگەر مانای تەوەسل لەدوعاکردنیشدا تەسکبکرێتەوە ئەوا تەنها ئەم سێ ڕێگا شەرعییەی هەیە کە باسکران، ئەگەر کەسانێکیش زیادە لەم سێ ڕێگایە بە دروست و شەرعی تێبگات ئەوا شرکی

---

(٧١) رواه البخاري و لفظه: (عن أَنَس بْن مَالِكٍ قَالَ أَصَابَتِ النَّاسَ سَنَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَبَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، هَلَكَ الْمَالُ وَجَاعَ الْعِيَالُ ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا أَنْ يَسْقِيَنَا . قَالَ فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَدَيْهِ ، وَمَا فِى السَّمَاءِ قَزَعَةٌ ، قَالَ فَثَارَ سَحَابٌ أَمْثَالُ الْجِبَالِ ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ عَنْ مِنْبَرِهِ حَتَّى رَأَيْتُ الْمَطَرَ يَتَحَادَرُ عَلَى لِحْيَتِهِ ، قَالَ فَمُطِرْنَا يَوْمَنَا ذَلِكَ ، وَفِى الْغَدِ وَمِنْ بَعْدِ الْغَدِ وَالَّذِى يَلِيهِ إِلَى الْجُمُعَةِ الأُخْرَى ، فَقَامَ ذَلِكَ الأَعْرَابِىُّ أَوْ رَجُلٌ غَيْرُهُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، تَهَدَّمَ الْبِنَاءُ وَغَرِقَ الْمَالُ ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا . فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَدَيْهِ وَقَالَ « اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا » . قَالَ فَمَا جَعَلَ يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ السَّمَاءِ إِلاَّ تَفَرَّجَتْ حَتَّى صَارَتِ الْمَدِينَةُ فِى مِثْلِ الْجَوْبَةِ ، حَتَّى سَالَ الْوَادِى - وَادِى قَنَاةَ - شَهْرًا . قَالَ فَلَمْ يَجِئْ أَحَدٌ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلاَّ حَدَّثَ بِالْجَوْدِ.)

وينظر: (١\٢٢٤ - ٢٢٦ رقم:٤٩٧ مختصر صحيح البخاري لشيخ ناصر).

(٧٢) رواه البخاري و لفظه : ( عَنْ أَنَسٍ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ - رضى الله عنه - كَانَ إِذَا قَحَطُوا اسْتَسْقَى بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَقَالَ اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا . قَالَ فَيُسْقَوْنَ ).

(٧٣) ينظر : مختصر صحيح البخاري لشيخ ناصر: (١\٣٠٦).



نەکردووە، بەمەرجێك ئەصلی پاڕانەوەکەی هەر لە خودا بێت، نەك پارانەوە لە کەسێك یان شتێك بکات و بیکاتە واسیتە بۆ ئەوەی دەنگی بە خودا بگەیەنێت، ئەمە شیرکی کافرەکانی مەککەیە.

پۆختەی ئەم باسەش ئاشناماندەکات بە سێ جورە تەوەسل کە ئەمانەن:

١ ــ **تەوەسلی شەرعی:** بریتییە لە هەموو خوداپەرستیەکی شەرعی لە بە جێگەیاندنی فەرمانەکانی خودا و دوورکەوتنەوە لە نەهیەکانی، بەڵام ئەگەر تەسکی بکەینەوە لە بابەتی دوعاکردنی داواکاری (دعاء المسألة)[٧٤] ئەوا سێ جوری هەیە:

أ ـ تەوەسل بە ناو وسیفەتەکانی پەروەردگار.

ب ـ تەوەسل بە کردەوە چاکەکانی بەندە.

ج ـ تەوەسل بە دوعای پیاو چاکێك کە لە ژیاندا بێت.

٢ ــ **تەوەسلی بیدعی داهێنراو:** بریتییە لە پارانەوە لە خودای پەروەردگار بە رێگایەکی بێ بەڵگە.

٣ ـ **تەوەسلی شیرکی:** بریتییە لە پارانەوە لە بێجگە لە خودا بە مەبەستی خۆ لە خودا نزیککردن.

---

(٧٤) زانایان بۆ تێگەیشتنی مانای (دوعا) دوعاکردن دەیکەنە دوو بەش:

یەکەمیان: هەموو جورە بەندایەتێکی شەرعی بۆ خودا دوعایە، چونکە مەبەست لێی داواکاری دوورکەوتنەوەیە لە دوزەخ و شادبوونە بە بەهەشت، بەدەست هێنانی رازیبوون و خوشەویستی ئەوە.(= دعاء العبادة \ الله هو المراد).

دووەمیان: دوعای داواکاری وەك خواستنی شیفای نەخوشی یان لادانی هەژاری، داواکاری هێز و توانی پشتبەستن...هتد (= دعاء المسألة\ الله هو المراد منه). ينظر: النبوات (١\٣٣٧ فصل في تمام القول في محبة الله) و مجموعة الفتاوى (٢\٤٥٦ ـ رسالة إلى أبي نصر المنبجي ـ ).

## بەشی دووەم: شەفاعەت

باسی شەفاعەت لە قورئانی پیرۆزدا بە دوو شێوەکراوە:

### یەکەم: شەفاعەت لای ئەهلی ئیمان:

شەفاعەت لای ئەهلی ئیمان بریتییە لە ڕێزلێنانی خودای پەروەردگار بۆ کەسی شەفاعەتکار و کەسی شەفاعەت بۆکراو، کە هەردووکیان ئەهلی یەکخوداپەرستین، شێوازی ئەم ڕێزلێنانەش ڕووخسەت دانی خودای پەروەردگارە، کە کەسی شەفاعەتکار دوعا بکات بۆ کەسی شەفاعەت بۆکراو لە ڕۆژی قیامەتدا. تەنها یەك شەفاعەت لەم پێناسەیە دەردەچێت ئەویش شەفاعەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەبوطـالبی مامی، کە لەسەر شیرك مردووە بەشەفاعەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) سزای کەم دەکرێتەوە [(٧٥)] ، بێجگە لەم شەفاعەتە خودای پەروەردگار ڕووخسەت بە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەدات بۆ پێنج جۆر لە شەفاعەت:

١ ـ شەفاعەتی گەورە بۆ دەستپێکردنی حیساب.

٢ ـ شەفاعەت بۆ ئەوکەسانەی چاکەو خراپەیان یەکسان بووە لە میزاندا.

٣ ـ شەفاعەت بۆ بەرزکردنەوەی پلەی کەسانێك لە بەهەشتدا.

٤ ـ شەفاعەت بۆ کەسانێك کە بە بێ حیساب بچنە بەهەشت.

---

(٧٥) عنِ العباسِ بنِ عبدِ المطَّلبِ رضي اللهُ عنه قال للنبيِّ صلى الله عليه وسلم: هل نفَعْتَ أبا طالبٍ بشيءٍ فواللهِ إنَّه كانَ يحُوطُك، ويَغْضَبُ لك! قالَ: (( هُو في ضَحْضاحٍ من نارٍ، ولولا أنا لكانَ في الدَّرْكِ الأسفَلِ مِن النَّارِ)). وفي رواية: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَذُكِرَ عِنْدَهُ عَمُّهُ أَبُو طَالِبٍ فَقَالَ: ((لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُجْعَلُ فِي ضَحْضَاحٍ مِنْ النَّارِ يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ يَغْلِي مِنْهُ أُمُّ دِمَاغِهِ)) رواهما البخاري و غيره

٥ ـ شەفاعەت بۆ ئەهلی کەبائر لە یەکخواپەرستان.

تەنها لە جۆری پێنجەمدا پێغەمبەرانی دیکە(علیهم السلام) و مەلائیکەت و ئیمانداران هاوبەشن لەگەڵ پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بۆ شەفاعەت کردن، پاش ئەوەی پەروەردگار ڕێزیان لێدەنێت، کە داوای شفاعەت بۆ کەسێکی دیاریکراو یان کۆمەڵێکی دیاریکراو بکەن، لە یەکخواپەرستان(الموحدين) کە پەروەردگار ڕێزی لێناون و هەڵیبژاردوون کە شەفاعەتیان بۆ بکرێت (٧٦) .

ئەمەی باسکرا مانای شەفاعەتە لای ئەهلی ئیمان و ئیسلام، ئەمەش چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزن سەبارەت بەم شەفاعەتانەی کە لە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگار ڕێی پێدەدات :

* ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾(٧٧) .

* ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ﴾(٧٨) .

* ﴿ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ ﴾ (٧٩) .

* ﴿وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ ﴾ (٨٠) .

---

(٧٦) لتسهيل فهم الشفاعة ينظر: الجداول الجامعة للعلوم النافعة (٣٦\١ ـ ٣٧ ) و للمزيد ينظر: اللآلىء البهية في شرح العقيدة الواسطية (٢٦٩\١ ـ٢٩٣ ط دار العاصمة )و شرح الطحاوية لأبي العز الحنفي (٣٤٩\١ ـ ٣٦٦ ط مؤسسة الرسالة).

(٧٧) الأنبياء: ٢٨. { هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵکە لە ڕابوردوودا چیان ئەنجامداوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن (دنیا و قیامەت، ڕابوردوو و داهاتوو، بۆ ئەو زاتە چوونیەکە)، فریشتەکانیش تکاکار نابن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت خوا پێی ڕازییە و ئەو فریشتانە لە ترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچیەک ئەنجام بدەن.} .

(٧٨) النجم: ٢٦ .{ زۆر فریشتەش لەئاسمانەکاندا هەن کەتکاو پاڕانەوەیان ناکام و بێ سوودە، مەگەر خوا مۆڵەت بدات بۆ هەرکەسێک کەشایستەیە و ڕازی بێت کەتکا بکات، یان تکای بۆ بکرێت}

(٧٩) البقرة: ٢٥٥.{...کێ یە ئەوەی (دەتوانێت) تکا بکات لە لای ئەو، بەبێ مۆڵەتی خۆی...}

(٨٠) سبأ: ٢٣. { هیچ تکاو پاڕانەوەیەك سودی نیە لای (خوا) مەگەر خۆی مۆڵەت بدات..}.

## دووەم: شەفاعەت لای ئەهلی شیرك:

هەر جۆرێكی شەفاعەت لەوەی باسكرا دەرچێت، شەفاعەتی ئەهلی شیركە، كە بەگەورەدانانی بێجگە لە خودایە بە شێوەیەك كە ئەم كەسە یان ئەم قەبرە یان ئەم بتە ئەگەر لێی بپاڕێتەوە ئەوا لە توانایدایە ڕزگاری بكات، و چاكەی بۆ بهێنێت و خراپەی لێ دووربخات یان لەخودا نزیكی بكاتەوە، ئەمەش شیركی ئەهلی مەككە بوو، كە دەیانگوت: بتەكانمان دەپەرستین تاوەكو لە خودا نزیكمان بكەنەوە: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾ . ئەمەش شەفاعەتی ئەهلی شیركە كە پەروەردگار لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باسی باطلی و بێ سودی ئەم شیركە دەكات لە دونیادا و لە قیامەتیشدا، وەسفی پەشێمانی ئەو كەسانە دەكات كە بەتەمای ئەم جۆرە شەفاعەتانە بوون لە دونیادا. ئەمەش هەندێك لەو ئایەتە پیرۆزانەن:

* ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِۖ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥۚ....﴾ (٨١)

* ﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ قُلۡ أَوَلَوۡ كَانُواْ لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ (٨٢)

---

(٨١) سبأ: ٢٢- ٢٣. { (ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە هاوەڵپەرستان) بڵێ: با هاناو هاوار ببەن بۆ ئەو شتانەی كە لەجیاتی خوا (دەیانپەرستن)!! (ئەوانە) خاوەنی بچوكتر لە ئەتۆمێك نین نە لە ئاسمانەكان، نە لە زەویدا، وەهیچ هاوبەشی و هاوكاریەكیشیان نیە تیایاندا، دەسەڵاتی هیچ پشتیوانی و یارمەتیەكیشیان نیە * هیچ تكاو پاڕانەوەیەك سودی نیە لای (خوا) مەگەر خۆی مۆڵەت بدات... }.

(٨٢) الزمر: ٤٣ - ٤٤.{ نەخێر، ئەوانە بیر ناكەنەوە، بەڵكو سەر لێشێواوەكان لە جیاتی خوا شتی تریان كردووە بە تكاكاری خۆیان؟! پێیان بڵێ: باشە، ئەگەر هیچیشیان بەدەست نەبێت و هەست و شعوریشیان نەبێت، (هەر دەیانكەنە تكاكار وبەتەمان شتێكتان بۆ بكەن؟) *ئینجا پێیان بڵێ: تكاكارو





* ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (٨٣)

* ﴿وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ (٨٤)

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ (٨٥) .

* ﴿وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ (٨٦) .

* ﴿ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾﴾ (٨٧) .

---

تکاوەرگرتن و تکاکردن، هەر هەمووی بەدەست خوایە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هەر ئەو خاوەنیانە، لەوەودوایش هەر بۆلای ئەو دەبرێنەوە.}.

(٨٣) یونس: ١٨.{ (بێ باوەڕان وخوانەناسان) شتێک دەپەرستن لەجیاتی خوا نە زیانیان پێدەگەیەنێت نە قازانج، دەشڵێن: ئا ئەو بت و شتانە تکا کارمانن لای خوا، پێیان بڵێ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم): باشە ئایا ئێوە خوا ئاگادار دەکەنەوە بەشتێک کە لەئاسمانەکان و لەزەویدا هەبێت و خوا نەیزانێت؟! پاک و بێگەردەو بەرزو بڵندەو دوورە لەوەی کەنەفامان دەیکەن بەهاوەڵی.}

(٨٤) البقرة: ٤٨.{خۆتان بپارێزن لە ڕۆژێك کە کەس فریای کەس ناکەوێت و کەس هیچی لەدەست نایەت و تکاکاری کەسیش وەرناگیرێت و بارمتەو گۆڕانکاری تیادا ئەنجام نادرێت و ئەو کەسانەی خوانەناسن یارمەتی نادرێن و سەرناخرێن.}

(٨٥) البقرة: ٢٥٤ .{ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەوماڵ و سامان ودارایی و (عیلم و زانست و تواناییە)ی کە پێمان بەخشیوون؛ ببەخشن، پێش ئەوەی ڕۆژێک بێت کە کڕین و فرۆشتن ودۆستایەتی و تکاکاری تیادانیە، (ئەو ڕۆژە) بێ باوەڕان هەر خۆیان لە ڕیزی ستەمکاراندان.}

(٨٦) البقرة: ١٢٣. {خۆتان بپارێزن لە ڕۆژێك کە کەس لە جیاتی کەس تۆڵەو پاداشت ناداتەوە، بە هیچ شێوەیەك کەس فریای کەس ناکەوێت، کەس بارمتەی لێوەرناگیرێت و، تکاو پاڕانەوەی کەس بۆ کەسانی تر سوودی نابێت (یاخی و ستەمکارانیش) سەرکەوتوونابن و سەرناخرێن...}

پوختەی ئەمەی باسکرا سەبارەت بە ماناکانی شەفاعەتی شەرعی و شەفاعەتی شیرکی بریتییە لە ئاگادارکردنەوەی موسڵمان لە دوو خاڵ:

یەکەمیان: شەفاعەتکار لە ئیسلامدا جودایە لە هزری ڕزگارکەر (الْمُخَلِص)[88] لە دیانەتە شێوێنراوەکاندا، کە وەکو خودا تەماشای مرۆڤێك دەکەن کە ئەم مرۆڤە توانای رزگارکردنی خەڵکانی هەیە لە سزای تاوان.

شەفاعەتکار لە ئیسلامدا تەنها کەسێکە کە ڕێزی لێنراوە بە ڕوخسەت پێدانی لە ڕۆژی قیامەتدا کە داوای شەفاعەت لەخودا بکات بۆ کەسانێکی یەکخوداپەرست کە خودا دەستنیشانیاندەکات.

بەداخەوە لەناو زۆر هۆزە کوردیەکانماندا دەبینین کە خەڵکانێك وەکو(الْمُخَلِص) تەماشای شێخەکانیاندەکەن کەئەمەش جۆرێکی شیرکی گەورەیە کە ناوەڕۆکەکەی دانی سیفەتەبەرزەکانی خالقە بە مەخلوق بە ناحەق.

دووەمیان: شەفاعەتی شەرعی واستەکاری کەسێك نیە لە نێوان بەندە و پەروەردگار بەڵکو تەنها ڕێزلێنانی پەروەردگارە بۆ شەفاعەتکار و شەفاعەت بۆکراوەی یەکخوداپەرست (الموحد). بۆیە تەشبیهکردنی شەفاعەت لە قیامەتدا بە واستەکاری دونیا بریتییە لە تەشبیهکردنی خالق بە مەخلوق ئەمەش خۆی لەخۆیدا شیرکە و دژی یەکخوداپەرستییە، پێویستە موسلمان لێی ئاگاداربێت.

---

(٨٧) یس: ٢٣ - ٢٤ . { ئایا ڕەوایە لە جیاتی خوا چەند پەرستراوێکی تر بۆ خۆم بڕیار بدەم کە هیچیان بەدەست نیە خۆ ئەگەر خوای میهرەبان بیەوێت تووشی ناخۆشیەکەم بکات، تکاو پاڕانەوەی ئەو پەرستراوانە هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنن و فریام ناکەون و ڕزگارم ناکەن * بێگومان من ئەگەر شتی وا بکەم، ئەو کاتە من لە گومڕاییەکی ئاشکرا دەبم.}

(٨٨) حول فكرة (المخلص) في النصرانية ينظر: مناظرة بين الإسلام و النصرانية لمناقشة العقيدة الدينية بين مجموعة من رجال الفكر من الديانتين الإسلامية و النصرانية (ص١٥٦،٢٦٤،٢٧٢ ط.الرئاسة العامة لإدارات البعوث العلمية والإفتاء والدعوة والإرشاد - رياض).





بەم پۆختە باسەی شەفاعەتیش بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە تێگەیشتنی ماناکانی شەفاعەتی شەرعی و شەفاعەتی شیرکی مەرجە لە تێگەیشتن و جێبەجێکردنی ماناکانی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ). ڕەنگدانەوەی ئەم مەرجەش لە فەرمودەی ئەبوهورەیرەدا (رضي الله عنه) دیارە کە پرسیار لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکات دەفەرمێت: ((ئەی پێغەمبەری خودا: بەختەوەرترین کەس کێیە بە شەفاعەتی تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا؟ (مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟) پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە وەڵامیدا بە ئەبو هورەیرە دەفەرمێت: دەمزانی کەس پێشە تۆ ئەم پرسیارە لەمن ناکات، لەبەر زۆری پەرۆشیت بۆ فێربوونی فەرمووده(( لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَلَّا يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلَ مِنْكَ، لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ)) بەختەوەرترین کەس بە شەفاعەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کەپڕ بەدڵ دەڵێت: (هیچ پەرستراوێك بەحەق نییە خودا نەبێت)((أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ خَالِصَةً مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ وفي رواية: مِنْ قَلْبِهِ))[٨٩] .

---

(٨٩) البخاري(٦٥٧٠ مكنز) و أحمد (٨٨٥٨). و فەرموودەی صەحیح سەبارەت بە شەفاعەت زۆرن بەڵام لە ترسی درێژبوونی بابەتەکە باس ناکەین بڕوانە: كتاب إثبات الشفاعة للذهبي ط. أضواء السلف و كتاب الشناعة على من رد أحاديث الشفاعة لعبد الكريم بن صالح الحميد.

## پێشەکی پێنجەم

## با ماناکان تێکەڵ نەکرێن و جێگۆڕکێ بە بابەتەکان نەکرێت!

ماسی گرتن لە ئاوی لێلدا پەندێکی پێشینانە، مەبەست لێی ئەو کەسانەیە کە بۆ هەواو هەوەسی خۆیان و بە هەواو هەوەسی خۆیان ماناکان تێکەڵ دەکەن جێگۆڕکێ بە بابەتەکان دەکەن بۆ ئەوەی ناحەق بەحەق پیشانبدەن هەڵە بە ڕاستی ڕووکەش بکەن. ئەم جۆرە کەسانە لە ڕووی بەڵگەوە نازانستییانە هەڵسوکەوت دەکەن لەگەڵ دەقەکان، لە ڕووی نییەتیشەوە جێی گۆمانن، بەڵام بۆ هیچ کەس نییە باس لە نییەتی بەرامبەر بکات خۆی و خودای خۆی، هەروەك بۆ هیچ کەسیش نییە ڕێگا لە بەدواداچوونی زانستیدا بگرێت .

ئەم پێشەکیە بەدواداچوونێکی پۆختی زانستییە بۆ پۆچەڵکردنەوەی هەندێك شوبوهات سەبارەت بە تەواف بە گۆڕی شێخ و سوجدەبردن بۆ شێخ یان گۆڕەکەی، کە کەسانێك بە هەواو هەوەس جێگۆڕکێ بە بابەتەکان دەکەن و ماناکان تێکەڵ دەکەن دەڵێن:

یەکەم: تەواف بەدەوری قەبر حەرامە، بەڵام شیرك نییە! چونکە عیبادەت نییە بۆ قەبرەکە، بەڵکو تەنها ڕێز لێنانە، بە بەڵگەی تەواف بە کەعبە، کە عیبادەت نییە بۆ کەعبە و تەنها ڕێزلێنانیەتی.

دووەم: سوجدەبردن بۆ شێخ یان گۆڕەکەی حەرامە، بەڵام شیرك نیە! چونکە تەحییەیە وەك سوجدەبردنی خانەوادەی یوسف بۆ یوسف(علیه السلام) ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ

﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا﴾ [(٩٠)] یان سوجدەبردنی فریشتەکان بۆ ئادەم(علیه السلام) ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ [(٩١)] بنەمای ئەم دوو شوبهەیە بۆ تێکەڵکردنی ماناکان و جێگۆڕکێی بابەتەکان دەگەڕێتەوە ئەمەش پۆختەی وەڵامەکەیانە:

یەکەم: خاوەن شوبهە مانای (ڕێزلێنان) و (عیبادەت) تێکەڵ دەکات تاوەکو بابەتەکە لە بابەتی کوفر و ئیمانەوە (بیروباوەر) دەربهێنێت بۆ بابەتی حەلال و حەرام لە فیقهدا. کە لە یەکەمیاندا باسی کارێك دەکرێت هۆکاری دەرچوونە لە بازنەی ئیسلام و ئەبەدی بوونە لە دووزەخدا، لە دووەمیاندا باسی کارێك دەکرێت کە خاوەنەکەی ئەگەر تاوانباریش بێت هەر لە ناو بازنەی ئیسلامدایە!

**عیبادەتی خودا** بریتییە لە بە جێگەیاندنی ئەمر و نەهیەکانی خودا بە خۆشەویستی و خۆ شکاندنەوە و بڕوابوون بەوەی کە تەنها خۆی شایستەی پەرستنە، پێویستە بپەرسترێت لە پێناو ڕازیبوونی، وەدەست هێنانی ئەم ڕازیبونەش گەیشتنە بە بەهەشتەکەی و دوورکەوتنە لە دووزەخەکەی [(٩٢)] .

---

(٩٠) یوسف: ١٠٠. {ئەوسا دایك وباوکی بەرز کردەوە بۆ سەر تەختی پاشایەتی و حوکمڕانی خۆی، هەمووان کڕنووشیان بۆ برد... }.

(٩١) البقرة: ٣٤. {کاتێکیش بەفریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێزو بەفەرمانی خوا، وەکو ڕووگەیەك) سوژدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کردو خۆی بە گەورەزانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە}.

(٩٢) پێناسەکە بنەماکانی عیبادەت کۆدەکاتەوە کە سێ بنەمان:

١ ـ بە جێگەیاندنی ئەمر و نەهی پەرستراو.





ناوی عیبادەتیش لە خۆ شکاندنەوە هاتووە (تَذَلُلْ) عەرەب دەڵێن: (طَرِيقٌ مُعَبَّدٌ إِذَا كَانَ مُذَلَّلًا، قَدْ وَطِئَتْهُ الْأَقْدَامُ )(٩٣)، خۆشەویستیش کاتێك عیبادەتە، کە ترس و هیوای لەگەڵ بێت، ئەم جۆرە خۆشەویستییەش کە ترس و هیوای لەگەڵە، تەنها بۆ خودایە، چونکە سزاو پاداشت تەنها لە دەست خودایە.

بەمە دەزانرێت عیبادەت مانای تایبەتی خۆی هەیە و جیاوازە لە تەنها ڕێزلێنان، کە مرۆڤی موسڵمان تەنها خوداپەرستە، بەڵام ڕێز لە هەموو مرۆڤێك دەگرێت بە جیاوازی نەتەوەو ئاینەکانیان .

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە عیبادەت تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئەوکەسەی سوجدە بۆ شێخ دەبات لای وابێت لە ڕێگای ئەم شێخەوە دەچێتە بەهەشت، یان شێخەکە کەفیلە بە بردنی بۆ بەهەشت! و بەجێگەیاندنی ئەمر و فەرمانەکانی شێخ بە ڕەهایی بە واجب بزانێت، شێخەکەی بە پیرۆز و بێ هەڵە تێبگات... هتد، ئەمە سوجدە

---

٢ ـ بەگەورە زانینی پەرستراو بە خۆشویستنی ناو و سیفەتەکانی بەشێوازێك کە تەنها خۆی شایستەی پەرستنە.

٣ ـ ترسان لە سزاکەی و هیواو تەماعی لە پاداشتەکەی.

ئەم بنەمایانەش هەموو بابەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆیان دەگەڕێنەوە.

ينظر: الموافقات للشاطبي (٣\٣٨٠ ط الدراز) و المنقذ من الضلال للغزالي(ص١٢٨ ط عبدالحليم محمود) و نظمها ابن القيم في النونية (٢\٢٣٧) فقال:

والعِلمُ أقسامٌ ثلاثٌ مَا لها ... مِنْ رابعٍ والحقُ ذو تبيانِ

علمٌ بأوصافِ الإله وفِعْلِهِ ... وكَذلك الأسماءِ للرَّحمنِ

والأمرُ والنهيُ الذي هو دينه ... وجزاؤُه يومَ المعادِ الثاني

(٩٣) ينظر: مجموعة الفتاوى (١٠\١٥٣).

بردنەکەی بۆ شێخ تەحییە نییە کە تەنها حەرام بێت و بڵێن تەئویلێکی بۆ هەیە، بەڵکو عیبادەتکردنە و شیرکی گەورەیە، پێویستە لێی ئاگاداربکرێت.

نابێت بە هیچ شێوەیەك ئەم مانایانە تێکەڵ بکرێن و جێگۆڕکێی بابەتەکان بکرێت وەکو پاساو بۆ تاوانەکە.

دووەم: بەچی دەزانین کە تەواف بە کەعبەی پیرۆز عیبادەت نییە بۆ کەعبە؟ بێگۆمان بە ئەمری خودای پەروەردگار: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾(٩٤) .

و بەچی دەزانین کە سوجدەبردنی فریشتەکان بۆ ئادەم (علیه السلام) عیبادەت نییە بۆ ئادەم؟ بێگومان بە ئەمری خودای پەروەردگار ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ (٩٥).

کەواتە عیبادەتەکە بۆ خودای پەروەردگارە، **چونکە بەجێگەیاندنی فەرمانەکەیەتی** کە بەم فەرمانە ڕێزی لە کەعبەی پیرۆز ناوە ڕێزی لە ئادەم ناوە! بە هەمان شێوە کاتێك بەناو شێخێکی جاهیل ڕێدەدات کە سوجدەی بۆببرێت یان فەرمان دەکات تەواف بەقەبری باپیرانی بکرێت ... ئەوکات کارەکە عیبادەتە بۆ شێخە فەرماندەرەکە، بێگومانیش هەموو شێخەکانی تەریقەت وانین .

لەکۆتایدا ئەحکامی شەرعی پەیوەندییان بە ناوەڕۆکەوە هەیە نەك تەنها ناو، سوجدە بۆ مەخلوق بردن و تەوافکردن بە دەوری گۆڕی مردوواندا، پێویستە زانستیانە ئینکار بکرێت و پاساوی بۆ نەبینرێتەوە بە تێکەڵکردنی ماناکان و جێگۆڕکێی بابەتەکان کە

(٩٤) الحج:٢٩.

(٩٥) البقرة: ٣٤.





کەسانێك هەوڵی بۆ دەدەن بە بیانووی دژایەتی هزری تەکفیر و یەکڕێزی موسڵمانان ڕاستییەکەشی ماسی گرتنە لە ئاوی لێل دا! خودا پشت و پەنای هەموومان بێت.

ئەمەی باسکرا لە لایەکەوە وەڵامە بۆ کەسانێك کە دانبەوەدەنێن کە سوجدەبردن بۆ کەسانێکی زیندوو، یان تەوافکردن بە گۆڕەکەیان پاش مردن، حەرامە نەك شیرك! و لە لایەکی دیکەوە وەلامە بۆ ئەوکەسانەی کە تەواف و سوجدەبردنەکە بە ڕەوا تێدەگەن! و ئەگەر ئامۆژگاری بکرێن، ئەوا ئامۆژگارکەر بە داعش و ئیرهابی ناو دەبەن و پشت لەو هەموو ئایەت و فەرمودانە دەکەن کە بەڵگەن لەسەر ناشەرعیەتی و شیرك و کوفری پاڕانەوە و پەنابردن بۆ بێجگە لە خودا ... خودا هیدایەتی هەموو لایەك بدات.

## پاشکۆیەك بۆ ئەم پێشەکییە:

## چەند بابەتێك بە پێوستمان نەزانی کە باسیان بکەین

بە پێویستمان نەزانی باسی سوجدەبردنی خانەوادەی یوسف بۆ یوسف (علیه السلام) بکەین ... هتد. کە شەرعی پێش ئیسلامە(شرع من قبلنا) و بە ئیسلام نەسخکراوە، هەروەك پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بە یەکێك لە هەڤاڵانی دەفەرمێت: «لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لأَحَدٍ لأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا»[٩٦]. واتە ئەگەر فەرمانم کردبا کەسێك سوجدە بۆ کەسێك ببات، ئەوا فەرمانم دەکرد ئافرەت سوجدە بۆ پیاوەکەی ببات.

---

(٩٦) رواه الترمذي (٣١٣ مكنز).

ئەم باسەمان(شرع من قبلنا) بە پێویست نەزانی، چونکە گرنگتر لەمە ئەوەیە ناوەڕۆکی بابەتەکە بزانرێت، کە ماناکانی عیبادەتە وەك باسکرا، نەك دەرگای بابەتێکی (أصول الفقه) بکەینەوە و لە بابەتی (بیروباوەڕ) دووربکەوین.

بە هەمان شێوە ئاوڕمان نەداوە لە بابەتی سەردانی گۆڕستان وەك پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت : «قَدْ كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ... فَزُورُوهَا فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الآخِرَةَ ـ وفي رواية: تذكر الموت ـ »[(٩٧)] واتە: (پێشتر ڕێگریم لێ کردبوون کە سەردانی گۆڕستانان بکەن، و ئیستا ڕێتان پێدەدەم، چونکە ئەم سەردانە قیامەت و مردنمان دەخاتەوە یاد)، لەبەر هەمان هۆکار ئەویش دووری بابەتی سەردانی گۆڕستان و ئادابەکانی، کە لە بابەتی (فقه ، آداب) نزیکن نەك (بیروباوەر).

هەرچەندە لە چەندین ڕوویەوە بابەتی سەردانی گۆڕستان لە بابەتی بیروباوەڕیش نزیکە لەوانە:

١ ـ یەکەمین جار نەهی کرا کە سەردانی گۆڕستان بکرێت، وەکو ڕێگاگرتنێك لە قەبرپەرستی، و پاش ئەوەی خەڵکەکە فێرە بیروباوڕ بوو، ڕێپێدرا بۆ وەبیرهاتنەوەی مردن و قیامەت.

٢ ـ سەردانی گۆڕستان هۆکارێکی بەرزی ئیمان و فێربوونی یەکخوداپەرستییە (توحید)، چونکە مرۆڤ لەم سەردانەدا هەست بە لاوازی خۆیدەکات بەرامبەر مردن و هەست بە کەمی تەقواداری خۆی دەکات بۆ کاروانی بەرەو قیامەت و هەست بە پێویستی دوعاکردن دەکات بۆ خۆی و مردووانی موسڵمانان!

---

(٩٧) رواه الترمذي (٢٨٣) و بنحوه عند مسلم.

## پێشەکی شەشەم

## ڕۆڵی داعش و هاوشێوەکانی لە بڵاوکردنەوەی قەبرپەرستی!

گومان لەوەدا نیە کە هەموو کتێبە ئاسمانیەکان هاتوون بۆ ئەوەی بتپەرستی نەمێنێت تەنها خودا بپەرسترێت، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە سەرەتای بانگەوازەکەی بۆ یەکخوداپەرستی دەفەرمێت: خودا منی ناردووە بۆ شکاندنی بتەکان (أرسلني الله بكسر الأوثان)[٩٨] و لە چەندین سیفری تەوراتدا نەهی کراوە کە پەیکەرتاشی بکرێت بۆ دروستکردنی بتێك و پەرستنی: (لا تَصْنَعُوا لَكُمْ أَوْثَاناً وَلا تُقِيمُوا لَكُمْ تِمْثَالاً مَنْحُوْتَاً أو نَصَبَاً وَلا تَجْعَلُوا فِي أَرْضِكُمْ حَجَرَاً مُصَوَّراً لِتَسْجُدُوا لَهُ لأَنِّي أَنَا الرَّبُ إِلَهُكُم)[٩٩] بەڵام هەرگیز جەنگی ئەم پێغەمبەرانە(عليهم السلام) دژی هونەری پەیکەرتاشی نەبووە، بەڵکو دژی ماناکانی بتپەرستی بووە، کە لە سەردەمی ئەواندا خەڵکان وەکو خودا تەماشای ئەم پەیکەرانەیان دەکرد و دەیانپەرستن بۆ ئەوەی لە خودا نزیکیان بکەنەوە، کەواتە پێویستە ماناکانی بتپەرستی تێبگەین

---

(٩٨) رواه مسلم (٨٣٢)بنحوه.

(٩٩) سفر اللاويين(٢٦\١) و التثنية (٥\٨) و نحوه في سفر الخروج(٢٠\٤).

و پێویستە بزانین کە هونەری وێنەکێشان و پەیکەرتاشی لای جولەکەو دیانەکانیش حەرام بوو، ئەوەی ئەمڕۆ لە کەنیسەکانی دیانەکاندا دەبینین لە وێنە و پەیکەرە گەورەکانی مەسیح مەریم و حەوارییەکان - بە مەزندەی خۆیان - پاپا گریگوری ڕێی پێدا کە لە کۆتایەکانی سەدەی شەشەمی زایینییەوە ژیاوە، بە بیانووی ئەوەی کە وێنەکێشان وەکو نووسینە نەخوێندەوار دەتوانێت بخوێنێتەوە بەمە ڕێی دا سەرهاتەکانی تەورات و ئینجل وێنەکێشبکرێن بۆ فێرکردنی نەخوێندەوار. بڕوانە: (قصة الفن ص١٦٢ - ١٦٤) تأليف أي. هـ . گومبرچ ترجمة : عارف حديقة ط: الهيئة العامة السورية للكتاب.





خۆمان لێبپارێزین نەك دژایەتی هۆنەری پەیکەرتاشی بکەین[(١٠٠)] و ئەگەر مانای جەنگ دژ بە بتپەرستی شکاندنی پاشماوەی پەیکەر و هۆنەرە بەردینەکانی بابلی و ئاشووری و سومەرِی بێت لە موزەخانەی موصل، ئەوا پێویستە ئەم بت شکێنانە چ بە پێغەمبەر سولەیمان(علیه السلام) بڵێن کە خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا باس لەوە دەکات کە سولەیمان (علیه السلام) پالە و سەربازی جنوکەی هەبووە پەیکەرتاشییان بۆ دەکرد: ﴿وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَـٰرِيبَ وَتَمَـٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَـٰتٍ ۚ

---

(١٠٠) ئەو زانایانەی بۆ حەرامی کاری پەیکەرتاشی دەچن بۆچوونەکانیان بەڵگەدارە، لە ڕوویەکی دیکەشەوە ڕێگری کردنە لە کردنەوەی دەرگای بتپەرستی یان شەخص پەرستی(سد الذرائع)، تاوەکو ئەوەی بەسەر قومی نوح (علیه السلام) هات لە پەرستنی (ود، سوع، یعوق، یغوث ) بەسەر ئەم ئوممەتە نەهێت، هەروەها ئەوەی ئەمڕۆ لە کەنیسەکاندا ڕوودەدات سبەی لە مزگەوتەکانماندا ڕوونەدات، چونکە ئەمەی ئەمڕۆ دەبینین لە پەیکەرپەرستی لە کەنیسەکاندا لە فەتوای پاپا گریگوری هەڵقولاوە کە ڕێپێدانی دا بۆ وێنەکێشانی بەسەرهاتەکانی تەورات و ئینجل لە کۆتایەکانی سەدەی شەشەم ـ وەك لە پەراوێزی پێشتردا باسکرا ـ . بەڵام ئەوەی پێویستە بزانین هیچ زانایەکیش لەمانە فەتوای لەناوبردنی پاشماوەی کەلتورە بەردینەکانی سومەرِی و ئاشووری و میسری نەداوە کە لە مۆزەخانەکانی عێراق و میسردا پارێزراوون وەکو بەڵگەی مێژووی بۆ شارستانیەتە لەناوچووەکان، چونکە بوونەتە بەشێك لە مێژوو ڕۆحی بتپەرستییان تیادا نەماوە. هەروەها هیچ زانایەکیش لەمانە ڕێی بە وێنەکێشان و پەیکەرتاشی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) و هەڤاڵەکانی(رضي الله عنهم) نەداوە چونکە ڕۆحی بتپەرستی لەم پەیکەرانەدا دەردەکەوێت ئەگەر بکرێن.

ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴾[101] ؟ و ئەگەر موسڵمانان یەك ڕابن لەگەڵ ئەوانەی مزگەوتی ئەهلی سوننە دەڕۆخێنن بە بیانووی ئەوەی قەبری تیادایە، چونكە نابێت مزگەوت لەسەر قەبر دروست بكرێت، ئەوا موسڵمانان لەم مزگەوت ڕۆخێنەرانە دەپرسن: مزگەوتەكانی ئەهلی سوننە قەبریان تیادانییە[102] بەڵكو شیعەكان قەبر پەرستن، بۆچی ئێوە مزگەوتی ئەوان نارۆخێنن لە شارەكانی ئەوان جیهاد ناكەن؟ یان بۆچی منارەی حەدبا دەڕۆخێنن كە سەدان ساڵە درۆشمی ئەهلی سوننەیە لە شاری موصل هیچ پەیوەندییەكی بە قەبر و قەبرپەرستییەوە نییە؟

ئەم پرسیارانە تەنها یەك وەڵامیان هەیە ئەویش ئەوەیە كە داعش و هاوشێوەكانی بە پاڵپشتی دەستە ڕەشەكانی دونیا هاتبوون شار و دێهاتی ئەهلی سوننە لە عێراق و

---

(١٠١) سبأ (١٢ - ١٣).{بۆ سولەیمانیش بامان خستە ژێر فەرمانیەوە، بەیانیان یەك مانگە ڕێ دەڕۆیشت و ئێواران یەك مانگە ڕێ دەهاتەوە، كانی مسیشمان بۆ تواندەوە، لە پەرییانیش هەندێكمان بۆ ڕاهێنا كە لەبەردەستیدا كار بكەن بە مۆڵەتی پەروەردگاری، جا ئەوەی لە فەرمانی ئێمە دەرچێت سزای دۆزەخی پێ دەچێژێت. * سولەیمان هەرچی بویستایە، پەرییەكان بۆیان دروست دەكرد، لە شوێنی خوا پەرستی و پەیكەرو حەوزو مەنجەڵی گەورەی بەجۆرێك كە لە جێگەی خۆی دامەزراوەو ناجوڵێت. ئەی نەوەو شوێنكەوتوانی داوود: ئێوە بە كردارو گوفتار سوپاسگوزاربن، هەرچەندە كەمێك لە بەندەكانم سوپاسگوزارن. }.

(١٠٢) هذا من حيث الغالب إلا من تأثروا بأهواء الشيعة و النصارى فخرجوا من السنة إلى السيئة. ينظر: العلاقة بين التشيع و التصوف ـ عرض و نقد ـ( ص٦٠٣ ـ ٦٩٦ ط دار الإستقامة) تأليف د. فلاح مندكار.

شام کاول بکەن، شیعەگەریەتی و قەبرپەرستی بە کردەوە نابەجێیەکانیان بڵاوبکەنەوە، بۆیە پێویستە بزانرێت ئەمانە دوورن لە بیرۆباوەڕی یەکخواپەرستی و دوورن لە سەلەفیەت و دوورن لە ئیسلام، هەروەك چۆن لە پێشەکی سێیەمدا باسمانکرد کە سوفیگەریەتی دوورە لە بیدعەی (وحدة الوجود) و (قەبرپەرستی).

هەر لەبەر ئەمەش با ناو و نازناوەکان ـ بێجگە لە ئیمان و ئیسلام[١٠٣] ـ لە لایەك دابنێین و بە ئینصافەوە لەسەر ئەم شێوازانەی قورئانی پیرۆز بوەستین کە باس دەکەن لە ماناکانی یەکخواپەرستی و دژەکانیان لە بت پەرستی و شەخص پەرستی و قەبرپەرستی، ئەم باسکردنەش کاکلەی پەیامی گشت پێغەمبەرانە(علیهم السلام) و خالّی پەروەردەکردن و بنیاتنانی کەسایەتی موسڵمانە بەڵکو تاکە پرۆژەی پەروەردەییە لە ئیسلامدا ... ﴿إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ﴾ [١٠٤]

ئەمانەی خوارەوەش پەنجا شێوازی قورئانی پیرۆزە لە ئاگادارکردنەوەی مرۆڤایەتی لە تاوانی پاڕانەوە لە بێجگە لە خودا، داواکارین لە خودای پەروەردگار کەئەم پەنجا شێوازە پیرۆزەی قورئانی پیرۆز پەنجا چرای گەشاوەبن، کە دڵان بە نوری تەوحید روناکبکەنەوە، هەروەها داواکارین لە خودای پەروەردگار کە لە شرك و گومراوی بتپەرستی بمانپارێزێت بە رەحمەتی خوی ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا ٱلۡبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ﴾[١٠٥] ...آمین.

---

(١٠٣) ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا﴾(الحج:٧٨).

(١٠٤) آل عمران: ٥١. { بەڕاستی هەر خوا پەروەردگاری منیش و ئێوەشە، کەواتە تەنها ئەو بپەرستن و ملکەچی ئەو بن، ئەمەیە ڕێبازی ڕاست و دروست}.

(١٠٥) إبراهيم: ٣٥.

## شێوازی یەکەمـ( ١ )ـــ:

### هاندان بۆ جوان بیرکردنەوە، کە بێجگە لە خودا

### کەس توانای نییە بەهانای مرۆڤەوە بێت و کەس هیچی بە دەستەوە نییە.

**( الحث على التفكر بأن الأمر كله بيد الله**
**و أن غير الله ليس له من الأمر شي من درء ضرٍ أو كشفه )**

(١) ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي
ٱلسَّمَـٰوَٰتِ ۖ ٱئْتُونِي بِكِتَـٰبٍ مِّن قَبْلِ هَـٰذَآ أَوْ أَثَـٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٤﴾
وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَهُمْ عَن
دُعَآئِهِمْ غَـٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَـٰفِرِينَ
﴿٦﴾﴾(١٠٦)

---

(١٠٦) الأحقاف: ٤ - ٦ { ئەی محمد ( صلى الله عليه وسلم ) هەواڵم بدەنێ : ئایا سەرنجتان داوە لەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن و، هاناو هاواریان بۆ دەبەن ؟ باشەئاخر ئەوانەچ شتێکیان لەزەویدا بەدیهێناوە، با پێشانم بدەن !... یاخود ئەوانە لەهەڵسوڕانی ئاسمانەکاندا هیچ هاوبەشی وهاوکاریەکیان هەیە؟!.. ( ئەگەر دەڵێن: بەڵێ ) دەکەواتە کتێبێکی ئاسمانیم نیشان بدەن کەپێش ئەم قورئانە بۆتان هاتبێت، یان دیاردەیەکی زانستی لەو ڕووەوە بیسەلمێنێت ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ! * جا ئیتر کێ لەو کەسە گومڕاترە کە دوعاو نزا و پاڕانەوە، ڕوو بەکەسێک یان شتێک دەکات، جگە لەخوا کە ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتیش لێی بپاڕێتەوە بێ سوودە، نەبەهانایەوە دەچێت، نەبەپەرستنەکەش دەزانێت، لەکاتێکدا ئەوانەلەدۆعاو پارانەوەی ئەوان بێ ئاگاو غافڵن و هەستی پێ ناکەن *کاتێکیش کەخەڵکی کۆدەکرێنەوە بۆ لێ





(٢) ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾ (١٠٧).

(٣) ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ وَلَا تَحۡوِيلًا﴾ (١٠٨).

(٤) ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ هَلۡ هُنَّ مُمۡسِكَٰتُ رَحۡمَتِهِۦۚ قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾ (١٠٩)

---

پرسینەوە، بت و پەرستراوەکان دەبنە دوژمن بۆ ئەو کەسانەکە لەدونیادا دەیانپەرستن، بەهیچ شێوەیەک بڕوایان پێ ناکەن، بەڵکو بەدرۆیان دەخەنەوە } .

(١٠٧) فاطر:٤٠ { ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ دەربارەی ئەو شتانەی کردوتانە بە هاوەڵ بۆ خواو هاناو هاواریان بۆ دەبەن جگە لە خوا، پیشانم بدەن کام شوێنی زەویان دروست کردووە، ئایا بەشداریەکیان هەیە لەگەڵ خوادا لە دروستکردنی ئاسمانەکاندا!! یاخود کتێبێکمان پێبەخشیوون تا دڵنیابن لە هاوکاریی بتەکان!! نەخێر وانی یە، بەڵکو ئەو ستەمکارانە هیچ بەڵێنێك بە یەکتری نادەن، تەنها خەڵەتاندن نەبێت.}

(١٠٨) الإسراء : ٥٦. {ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هاوەڵگەران بڵێ: ئادەی هاناو هاوار بکەن لەو بت و شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن (ئایا هیچیان لە دەست دێت؟ دڵنیابن کە ئەوانە) نە دەتوانن بەڵاو ناخۆشیەکتان لەسەر لابەرن. نەدەتوانن بارودۆخ بگۆڕن. } .





(٥) ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ﴾(١١٠)

(٦) ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥ...﴾(١١١)

(٧) ﴿وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡۖ فَمَآ أَغۡنَتۡ عَنۡهُمۡ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِي يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ لَّمَّا جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَمَا زَادُوهُمۡ غَيۡرَ تَتۡبِيبٖ ﴿١٠١﴾﴾(١١٢)

---

(١٠٩) الزمر : ٣٨.{ئەگەر لە بێ باوەڕان بپرسیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؛ بێ دوودڵی و بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێن: خوا، باشە؛ پێمان بڵێن: ئەوەی هاواری لێ دەکەن لە جیاتی خوا، ئەگەر ئەو خوایە بیەوێت تووشی بەڵاو ناخۆشیەکم بکات، ئایا ئەو بتانە دەتوانن فریام بکەون و نەهێڵن؟ یاخود ئەگەر بیەوێت ڕەحمەت و بەخششێکم پێ ببەخشێت، ئایا ئەوانە دەتوانن ئەو ڕەحمەت و بەخششە قەدەغە بکەن و نەیەڵن و بیگرنەوە؟! تۆ ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: من خوام بەسە کە لە تەنگانەدا دەگاتە فریام، دەبا ئەوانەی پشتیوانیان دەوێت هەر پشت بەو ببەستن. }.

(١١٠) الأعراف : ١٩٧. {ئەوانەی کە ئێوە جگە لە خوا هاناو هاواریان بۆ دەبەن ناتوانن سەرکەوتوتان بکەن، (تەنانەت) ناتوانن یارمەتی خۆیشیان بدەن.}.

(١١١) سبأ: ٢٢ - ٢٣. {(ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هاوەڵپەرستان) بڵێ: با هاناو هاوار ببەن بۆ ئەو شتانەی کە لەجیاتی خوا (دەیانپەرستن)!! (ئەوانە) خاوەنی بچوکتر لە ئەتۆمێك نین نە لە ئاسمانەکان، نە لە زەویدا، وەهیچ هاوبەشی و هاوکاریەکیشیان نیە تیایاندا، دەسەڵاتی هیچ پشتیوانی و یارمەتیەکیشیان نیە. * هیچ تکاو پاڕانەوەیەك سودی نیە لای (خوا) مەگەر خۆی مۆڵەت بدات ....}.





(٨) ﴿وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ۝٢٠ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ
أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ۝٢١﴾ (١١٣)

(٩) ﴿لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ
كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ۝١٤﴾ (١١٤).

(١٠) ﴿وَٱللَّهُ يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقۡضُونَ بِشَيۡءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ
هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ۝٢٠﴾ (١١٥).

---

(١١٢) هود: ١٠١ . {ئێمە ستەممان لێنەکردن و بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، ئەوسا ئەو پەرستراوانەیان کە لەجیاتی خوا هاواریان لێ دەکردن، فریای هیچ شتێکیان نەکەوتن کاتێك فەرمانی پەروەردگاری تۆ هات، هیچیان بۆ زیاد نەکردن جگە لە تیاچوون نەبێت}.

(١١٣) النحل: ٢٠ - ٢١.{ئەو بت و کەس و شتانەی کە هاواریان لێ دەکەن و دەیانپەرستن جگە لە خوا، هیچیان پێ دروست ناکرێت، لە کاتێکدا کە خۆیان دروست دەکرێن* ئەوانە مردوون و زیندوو نین، هەستیش ناکەن کەی خۆیان و خەڵکی زیندوو دەکرێنەوە}.

(١١٤) الرعد : ١٤. {هەر بۆ خوایە بانگەوازی حەق و ڕاستی، (بەڵام) ئەوانەی هاناو هاوار بۆ کەسێکی تر دەبەن جگە لەو زاتە، هاوار لێکراوان بە هیچ شێوەیەك بەهانایانەوە نایەن و وەڵامیان نادەنەوە، مەگەر وەکو کەسێك (تینووی بێت لە دوورەوە) دەستەکانی درێژە بکات بۆ ئاو تا بیگەیەنێتە دەمی، کەچی بێسوودەو ناگاتە دەمی، بێگومان دوعا نزای بێ باوەڕان تەنها لەناو تاریکی و گومڕایدایە و هیچی تر نی یە} .

(١١) ﴿ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ۖ
يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ ﴾ (١١٦)

پۆختەی مانای ئایەتەکان تەحەداکردنە، کە کەس شتێکی بەدەستەوە نییە، تاوەکو بە هانای مرۆڤەوە بێت بێجگە لە خودا، کەواتە بۆچی پەنا بۆ شتێك یان کەسێك ببەین کە بێدەسەڵاتە و هیچی پێناکرێت!

---

(١١٥) غافر: ٢٠ .{ هەمیشە خوا دادوەریی لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی ئەنجام دەدات، ئەوانەی جگە لەو زاتە هاواریان لێ دەکەن، هیچ دەسەڵات و داوەریەکیان لە دەست نایەت، بەڕاستی هەر خوا خۆی بیسەر و زانایە}

(١١٦) آل عمران: ١٥٤ .{ دەستەیەکی تریش بەڕاستی خەمی خۆیان بوو، گومانی ناڕەوایان دەبرد بەخوای گەورە بە گومانی نەفامانە، دەیانوت: ئایا ئێمە لەم کارەدا (لە بەدەستهێنانی سەرکەوتن) هیچ شتێکمان هەیە؟! (ئەوپشتیوانەی کەخوا بەڵێنی پێدابووین بۆ نەهات؟!) ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: بێگومان هەموو شتێک بەدەست خوایە}.

## شێوازی دووەم(٢):-

### بێ دەسەڵاتی پێغەمبەران (علیهم السلام) لە بەهاناوەهاتنی شوێنكەوتووانیان

### (لیس للأنبیاء من الأمر شيء)

(٦) ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ (١١٧)

(١) ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُواْ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا
﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّى لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَٰغًا مِّنَ ٱللَّهِ
وَرِسَٰلَٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ (١١٨)

---

(١١٧) ال عمران :١٢٨ . { بێگومان تۆ هیچ شتێكت لە كاروباری بەندەكان بەدەست نیە (بەڵكو هەمووشت بەدەست خوا خۆیەتی) ئەگەر تەوبەو پەشیمانیان لێ وەربگرێت، یان سزاو ئازاریان بدات، (سەربەستە)، چونكە ئەوانە ستەمكارن}.

(١١٨) الجن : ٢٠ - ٢٣ { پێیان بڵێ: من هەر بەردەوام دەبم و هەر بانگەواز دەكەم بۆ لای پەروەردگارم، كەسیش ناكەمە هاوەڵ و شەریكی. * هەروەها پێیان بڵێ: من هیچ جۆرە زەرەرو زیانێكم بەدەست نیە، هەروەها هیدایەتیش بەدەست من نیە (ئەگەر خۆتان بیر نەكەنەوە، قەناعەت بەزۆر نی یە). * بڵێ: بەڕاستی من هەرگیز هیچ كەسێك لە خوا پەنام نادات ئەگەر خوا بیەوێت تووشی زیانێكم بكات و هەرگیز پەناگایەكم دەست ناكەوێت جگە لای خوا نەبێت. بەڵكو من تەنها گەیاندنی پەیامەكان و بەرنامەی خوام لەسەرە، جا ئەوەی لە خواو پێغەمبەرەكەی یاخی ببێت ئەوە با دڵنیابێت كە دۆزەخی بۆ ئامادەكراوە بۆ هەمیشەو هەتاهەتایی.}.





(٢) ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَـٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ
﴿٢٨﴾﴾ (١١٩)

(٣) ﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ
إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾﴾ (١٢٠)

(٤) ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ
ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَـٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾﴾ (١٢١)

---

(١١٩) ملك:٢٨.{ هەروەها پێیان بڵێ: باشە، ئەگەر خوا، من و هەموو ئەو كەسانەی كە شوێنم كەوتوون لەناو بەرێت، یان بەزەیی پیاماندا بێتەوە، ئەوسا كێ هەیە بێ باوەڕان لە سزای پڕ ئێشی دۆزەخ ڕزگار بكات؟! (ئەگەر لەسەر یاخی بوونیان بەردەوام بن)}.

(١٢٠) الأنعام : ٥٠ . {ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: من پێتان ناڵێم گەنجینەكانی خوا لای منە، هەرەها لەنهێنی و شاراوەكانیش هیچ نازانم و ئاگادارنیم و پێتان ناڵێم بەڕاستی من فریشتەم، بەڵكو تەنها شوێنی ئەوە دەكەوم كە بەوەحی و نیگا پێم دەگات، (هەروەها) پێیان بڵێ: ئایا كوێرو چاوساغ وەک یەكن؟ (لە ڕاستیدا بێ باوەڕ وەک كوێروایە كەلە تاریكایدا گیری خواردبێت و لە هەموو تاوێكی ژیانیداو لە هەموو هەنگاوێكیدا بەتەمای كۆسپ و تەگەرەیە، لەو لاشەوە ئیماندار بینایە، چاو ساغە، هەموو شتێكی لاروونە، دەزانێت بۆچی هاتووە، بۆچی دەژی، بەرەوكوێ دەچێت) ئایا بۆ بیرناكەنەوە و تێنافكرن (لەو ڕاستیانە).}

(١٢١) الحاقة: ٤٤ - ٤٧ . {خۆ ئەگەر محمد صلى الله عليه وسلم هەندێك قسەو گوفتار بەدەم ئێمەوە هەڵبەستایە* ئەوە بەهێزو دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت* لەووەدوا ڕەگی دڵی دەپچڕێنین و دەیمرێنین* ئەوسا هیچ كەسێك نی یە لە ئێوە بەربەست و بەرگری بكات لە ئێمە}





(٥) ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا
لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا
لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا﴾[١٢٢]

(٦) ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ
مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾﴾
[١٢٣]

---

(١٢٢) الإسراء : ٧٣ - ٧٥ { ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم موشريك و هاوەڵگەران خەريك بوو تۆ لابدەن لەوەی کە بەوەحی و نيگا بۆمان ڕەوانە کردوويت، تاشتێکی ترمان بۆ هەڵببەستيت و شێوازی کارو بانگەوازت بگۆڕيت، ئيتر ئەو کاتە ئەگەر بەقسەی ئەوان بکەيت ئەوان تۆ دەکەنە هاوەڵ و خۆشەويستی خۆيان (چونکە بەدڵی ئەوانت کردووە)! * خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پايەدارو دامەزراو نەکردايە، ئەوە بەڕاستی نزيك بوويت (بەمەزەندەی خۆت، بۆ بەرژەوەنديی بانگەوازەکەت) کەمێك بە لاياندا مەيل بکەيت و بەدڵی ئەوان بکەيت!! * ئەو کاتە ئيتر دوو بەرامبەری (هاوەڵگەران) لە دنياداو بە دوو بەرامبەری ئەوان لە دوای مردن سزاو ئازارمان پێ دەچەشتيت، پاشان کەسيشت دەست نەدەکەوت فريات بکەوێت و لەدەستی ئێمە ڕزگارت بکات}

(١٢٣) المائدة: ١٧ .{سوێند بێت بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بوون کە وتيان: بەڕاستی خوا، هەر مەسيحی کوڕی مەريەمە، (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێيان) بڵێ: ئەگەر خوا بيەوێت مەسيحی کوڕی مەريەم و دايکی و هەرچی لەسەر زەويدا هەيە





(٧) ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً ۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ
بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾﴾(١٢٤) .

(٨) ﴿مَّا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا
يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ ۗ انظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الْآيَاتِ ثُمَّ انظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ
﴿٧٥﴾﴾(١٢٥) .

---

لەناوی بەرێت، ئەوە کێ یە لە بەرامبەر خواوە دەسەڵاتی شتێکی هەیە؟ (کەواتە ئەویش و دایکیشی و ئەو خەڵکەش بەدیهێنراوی خوان و لە دەسەڵاتی دەرناچن، ئیتر بە چ بەڵگەیەک قسەی وا نابەجێ دەکەن؟!، بەمەرجێک) خوا زاتێکە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیاندا هەیە هەر ئەو خاوەنیانە، هەرچی بیەوێت دروستی دەکات (شتێکی ئاساییە ئەو زاتە مەسیح بێ باوک دروست بکات)، چونکە خوا دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێکدا (هەموو شت لای ئەو ئاسانە).}

(١٢٤) {سوێند بەخوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کردووە و هاوسەرو نەوەشمان پێداون، هیچ پێغەمبەرێکیش بۆی نەبووە بەویستی خۆی موعجیزە نیشان بدات ئەگەر ویستی خوای لەسەر نەبووبێت، بۆ هەموو کارو ڕووداوێکیش بڕیارێکی تایبەت هەیە.}.

(١٢٥) {مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ شتێک نی یە (نە خوایە و نە کوڕی خوایە) جگە پێغەمبەرێکی خوا نەبێت، بە ڕاستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش ڕابوردوون، دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست و ڕاستگۆیە، هەردووکیان خواردنیان دەخوارد (وەکو هەموو ئینسانێک) سەیر بکە و سەرنج بدە (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار) چۆن هەموو فەرمان و بەڵگەیەکیان بۆ ڕوون دەکەینەوە، لەوەودوا تەماشاکا چۆن ڕوویان لە حەق وەردەچەرخێنرێت و لەڕاستی لادەدرێن! }





پوختەی ئەم ئایەتانە ئەوە دەگەیەنێت، كە پێغەمبەرانیش (علیهم السلام) بێجگە لە گەیاندنی پەیامەكە هیچیان بەدەست نییە، بەڵكو لاواز و بێدەسەڵاتن، چونكە مرۆڤن، پێویستییان بە خواردن و خواردنەوە و ژنهێنانە، لەژێر بەرپرسیاری دان بەرامبەر پەروەردگار، ئەگەر ئەمانە كە باشترینی ئادەمیزادن هیچیان بەدەستەوە نەبێت، بەرامبەر پەروەردگار ئەمە حالیان بێت، دەبێ شێخ و مەلا چییان بەدەست بێت؟! تاوەكو بەدەوری گۆڕەكانیان بسوڕێینەوە یان داواكارییان لێبكەین و بیانكەینە واسیتە، تاوەكو دەنگمان بەخودا بگەیەنن! بێگومان ئەم كارانە دژایەتین بۆ یەكخوداپەرستیی و دەرچوونن لە پەیامی ئیسلام و بنەماكانی ئیمان.

هەروەك پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) لە سەرەتای بانگەوازەكەی خزم و كەسانی كۆدەكاتەوە و پێیان ڕادەگەیەنێت كە ڕزگاربوون لە سزای خودا تەنها لە دەست خودایە و دەفەرمێت: (يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ اللهِ يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ اللهِ يَا أُمَّ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ عَمَّةَ رَسُولِ اللهِ يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ اشْتَرِيَا أَنْفُسَكُمَا مِنَ اللهِ لاَ أَمْلِكُ لَكُمَا مِنَ اللهِ شَيْئًا سَلاَنِي مِنْ مَالِي مَا شِئْتُمَا) رواه البخاري (٣٥٢٧). ئەمە ڕاستی یەكخوداپەرستییە پێویستە ماناكانی شەفاعەتیش لە ڕوانگەی ئەم ڕاستییەوە لێی تێبگەین و بزانین.

## شێوازی سێیەم ( ٣ ) :

### هاواربردن بۆ بێجگەلەخودا، هاواربردنە بۆ شتێك كە توانای بیستنی نییە، چجای وەڵامدانەوە!؟

(الذين يستغيثون بغير الله، يستغيثون بما لا يسمعهم، فكيف يغيثهم!؟)

(١) ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۚ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن
قِطۡمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثۡلُ خَبِيرٖ ﴿١٤﴾﴾ (١٢٦)

(٢) ﴿وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَحۡيَآءُ وَلَا ٱلۡأَمۡوَٰتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسۡمِعُ مَن يَشَآءُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي
ٱلۡقُبُورِ ﴿٢٢﴾﴾ (١٢٧) .

پوختەی دوو ئایەتەکە ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە، ئەویش ئەوەیە کە نابیستە وەڵام ناداتەوە (١٢٨) !

---

(١٢٦) فاطر: ١٣ - ١٤ . { ئائەو خوایە پەروەردگارتانە خاوەنی هەموو موڵک و بەدیهاتووەکانە، (بەڵام) ئەوانەی جگە لەو هاناو هاواری بۆ دەبەن ولێی دەپاڕێنەوە تەنانەت خاوەنی توێکڵە تەنکەکەی دەوری ناوکی خورمانیش نین. * خۆ ئەگەر هاناو هاواریان بۆ بەرن گوێیان لێتان نییە و نابیستن، ئەگەر بشبیستن بە دەمتانەوە نایە، ڕۆژی قیامەتیش حاشا دەکەن لێتان و لەوەی کە بە (خواتان) زانیوون، بێگومان کەس نییە وەک (خوا) ئاگاو زانا بێت و هەواڵی ڕاست و دروست بگەیەنێت}.

(١٢٧) فاطر: ٢٢ . { زیندووان و مردووانیش هاوتای یەك نین بێگومان خوا ڕاستی دەدات بەگوێی هەر کەسێکدا بیەوێت بەڵام تۆ ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناتوانیت پەیامەکەت بگەیەنیت بەو کەسانەی کە لەناو گۆڕدان (مەبەست کافرانە کە وەك مردوو نابیستن و ئەگەر بشبیستن سوودی لێ وەرناگرن)}.

## شێوازی چوارەم(٤):

### فەرمانکردن بە پاڕانەوە لە خودا

### (الأمر بطلب الدعاء من الله)

(١) ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾(١٢٩)

(٢) ﴿ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾(١٣٠)

---

(١٢٨) ينظر : الآيات البينات في عدم سماع الأموات على مذهب الحنفية السادات تأليف: العلامة نعمان بن المفسر الشهير محمود الآلوسي ط. المكتب الإسلامي.

(١٢٩) الغافر:٦٠. {ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن؛ ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتیەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.}

(١٣٠) الأعراف : ٥٥ – ٥٦. {هاناو هاوار بکەن لە پەروەردگارتان بەپاڕانەوەی بەکوڵ، بەنهێنی (لەکات و شوێنی لەباردا) چونکە بەڕاستی ئەو زاتە دەست درێژکارانی خۆش ناوێت ( مەبەست ئەوانەن کە هاناو هاوار بۆ غەیری خوا دەبەن). * (خەڵکینە فەساد و گوناە و تاوان ئەنجام مەدەن لە زەویدا دوای ئەوەی چاکەکاریی ڕەنگی گرتووەو (خەڵکی خەریکن خووی پێوە دەگرن)، بەردەوام هاناو هاوار بۆ خوا بەرن لە ترسی سزای دۆزەخ و بەئومێدی بەدەستهێنانی بەهەشت، بەڕاستی ڕەحمەتی خوا نزیکە لە چاکەکاران و چاکەخوازانەوە.}





(٣) ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾ (١٣١)

(٤) ﴿فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ (١٣٢)

(٥) ﴿هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ (١٣٣)

(٦) ﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ﴾ (١٣٤)

---

(١٣١) الإسراء : ١١٠. {پێیان بڵێ: ئێوە لە نزاو دوعاتاندا هاوار لە (الله) بکەن، یان بەسیفەتی پیرۆزی (الرحمن) هانای بۆ بەرن، بەهەر ناوو سیفەتێکی جوان و بەرز هاواری لێبکەن و نزا بکەن دروستە، چونکە ئەو خاوەنی هەموو سیفات و ناوە پیرۆزو جوانەکانە، بەهەر سیفەتێك کە لەگەڵ داخوازیەکانتاندا گونجا، داوای لێ بکەن، لەکاتی داواکردنی ڕزق و ڕۆزیدا بە (یا ڕزاق، یا وهاب) لەکاتی داوای سەرکەوتندا بە (یا قوی یا متین یا عزیز یا ....هتد، ئەی ئیماندار) }.

(١٣٢) الغافر :١٤. {کەواتە ئەی ئیمانداران: ئێوە هەر هانا و هاوار بۆ خوا بەرن و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو بن، ئەگەر چی کافرو بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت.}.

(١٣٣) الغافر : ٦٥. {ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام هەر زیندووە، جگە لەو خوایەکی تر نیە، کەوابوو هانا و هاوار و نزاتان ڕوو بەو بێت، ملکەچ و فەرمانبەرداری بەرنامە و ئاینەکەی ئەو بن، سوپاس و ستایش بۆ خوا، کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە}.

(١٣٤) الأعراف:٢٩. {(ئەی محمد(صلی الله علیه وسلم) بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لەکاتی هەرپەرستن و نوێژێکدا، لە هەموو مزگەوتێکدا، ڕووی دڵ و ڕوخسارتان بەڕاستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە،

(٧) ﴿ وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ٣٢ ﴾ [١٣٥] .

پوختەی ئەم ئایەتانە ئەوە دەگەیەنێت کە پاڕانەوە بە ئیخلاص و داواکاری لە پەروەردگار فەرمانپێکراوە، پشتکردن لە بەجێگەیاندنی ئەم فەرمانانەش سیفەتی نەخوازراوی تەکەبوری بەندە دەنوێنێت کە جێگای تۆڕەیی پەروەردگارە، چونکە دژە بۆ پەیامی یەکخواپەرستی.

---

لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکە هەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە...}

(١٣٥) النساء: ٣٢ . { هەمیشە و بەردەوامیش داوای زیادە بەخشش و بەهرەی خوا بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بەهەموو شتێک زانایە..}

## شێوازی پێنجەم( ٥ )ـ:

### پەرۆشکردنی مرۆڤ بۆ پاڕانەوە تەنها لە خودا، بەوەی کە خودا پێیخۆشە بەندە لێی بپاڕێتەوە، و پێیخۆشە وەڵامی دوعاکار بداتەوە

### (الترغيب في الدعاء من الله لأن الله يحب أن يدعى منه كما يحب أن يجيب الدعاء)

(١) ﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًۢا﴾(١٣٦).

(٢) ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾(١٣٧).

ئەگەر زانیت خودا پێیخوشە هاناو هاواری بۆ ببرێت، پێیخوشە وەڵامی ئەم هاناو هاوارەش بداتەوە، بۆچی داواکاری و هاناو هەوارت بۆ کەسێك یان شتێکی دیکە دەبەیت؟!

(فائدە) ئەوەی جێی سەرنجە لەم ئایەتەدا پەروەردگار بە پێغەمبەرمان (صلی اللہ علیه وسلم) دەفەرمێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى ....﴾ بەڵام لە دەیان ئایەتی دیکەدا،

---

(١٣٦) الفرقان :٧٧. {تۆ ئەی محمد صلی الله علیه وسلم پێیان بڵێ: (خەڵکینە) پەروەردگارم هیچ گوێتان پێ نادات و نرختان بۆ دانانێت، ئەگەر دوعاو نزاو خواپەرستیتان نەبێت، کەچی زۆربەتان هەر پێغەمبەر و قورئانتان بە درۆزانی، ئەگەر بەردەوام وابن، ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لە ئایندەدا یەخەتان پێ دەگرێت لە کۆڵتان نابێتەوە.}.

(١٣٧) البقرة :١٨٦. {(ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بە هاناو هاواری دۆعا گۆیانەوە دەچم هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنەبەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان). }.





پەروەردگار بە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت : ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ....﴾(البقره:٢٨٩) و ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ......﴾ (البقره:٢١٧) و ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ......﴾(البقره:٢١٩) ...هتد واتە: پرسیاری فلانە شتت لێدەکەن، نافەرمێت ئەگەر پرسیاری فلانە شتیان لێکردی وەك لە دوعاکردن! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ شتێك لای پەروەردگار لە دوعا و پاڕانەوەی بەندە بەرزتر و بەنرختر نییە، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) ئاماژە بەمەدەکات و دەفەرمێت: « لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى مِنَ الدُّعَاءِ » أخرجه أحمد

## شێوازی شەشەم( ٦ )ـ:

### پەرۆشکردنی مرۆڤ بۆ پاڕانەوە تەنها لە خودا بەوەی کە تەنها خودا وەڵامی دوعاکار دەداتەوە

### ( الترغيب في الدعاء من الله ببيان أنه لا يجيب دعوة الداعي إلا الله )

(١) ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾[١٣٨] .

ئەگەر وەڵامدەری دوعا تەنها خودا بێت، بۆچی دوعا لە بێجگەلە خودا بکرێت!؟

(١٣٨) النمل:٦٢. {ئایا کێیە جگە لە زاتی پەروەردگار کە بێت بە هانا و هاواری لێقەوماو و بێ دەرەتان و بێ داڵدەوە، کاتێک نزا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبات و دەتانکاتە نیشتەجێ و جێنشین لە زەویدا، ئایا ڕەوایە لەگەڵ ئەو زاتەدا خوای تر هەبێت؟! کەمێک یاداوەری وەربگرن و تێفکرن و بیربکەنەوە}.

## شێوازی حەفتەم ( ٧ ):

### پەرۆشکردنی مرۆڤ بۆ پاڕانەوە تەنها لە خودا، بە باسی ئەهلی بەهەشت کە پاڕانەوەیان لە خودا لە دونیادا هۆکاری چوونە بەهەشتیان بووە

### ( الترغيب الى الدعاء من الله بذكر أهل الجنة الذين دخلوا الجنة بذلك )

(١) ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾
فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ
الرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾﴾ (١٣٩).

ئەگەر لە بەهەشتیان گوێبیست بی، کە هۆکاری چوونە بەهەشتیان ئەوەبووە کە تەنها لە خودا پاڕاونەتەوە، ئەوا چ نەفامییەکە پشت لەم پاڕانەوەیە بکرێت و چ ناژیرییەکە لە بێجگەلە خودا بپاڕێیتەوە؟

---

(١٣٩) الطور: ٢٥ - ٢٨. {(جا دوای ئەو عەیش و نۆش و کەیف و ئاهەنگە ڕوودەکەنە یەکترو دەستەدەستەلەیەک نزیک دەبنەوە، پرسیار لەرابوردوی یەکتر دەکەن (دیارە هەرکەسەلەو بەیەکگەیشتنانەدا بەشێک لەسەرگوزەشتەی خۆی نیشانی ئیماندارانی هاوەڵ و میوانی دەدات، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی پێویستدا، کەبەدەزگای زۆر پێشکەوتوو تۆمارکراوە) * سەرەنجام هەموو بەیەک دەنگ دەڵێن: بەڕاستی (کارێکی چاکمان دەکرد سوپاس بۆ خوا) چونکەکاتی خۆی کەلەناو ماڵ و خێزانماندا بووین، ترسی لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەتمان هەبوو، هەروەها بەبەزەییش بووین لەناویاندا و مەبەستمان بوو ئەوانیش وەک ئێمە خواناس بن * بەهۆی ئەوەوەخوای میهرەبانیش لای ڕەحمەتی لێ کردینەوە و منەتباری کردین و لەسزای دۆزەخی پڕئێش پاراستینی * بەڕاستی ئێمە کاتی خۆی هاناو هاوارمان هەر بۆ ئەو دەبردو دەمانپەرست، چونکەبێگومان هەر ئەو زاتەخوایەکی چاکەخوازو میهرەبان و دلۆڤانە}

## شێوازی هەشتەمـ( ٨ )ـ

### پەرۆشکرنی موسڵمان بۆ دوعاکردن لە خودا بە

### فێرکردنی ماناکانی تەوەسل بە سیفەتە جوانەکانی خودا و ناوە بەرزەکانی .

### ( الترغيب في الدعاء بالتوسل إلى الله بأسماءه و صفاته )

(٣) ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ (١٤٠)

(٤) ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ (١٤١)

---

(١٤٠) آل عمران: ١٩٣ - ١٩٤. { پەروەردگارا؛ بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێک بوو، بانگی کردین بۆ ئیمان و (دەیفەرموو): ئیمان بهێنن بە پەروەردگارتان جا ئێمەش (بێ دوودڵی)، خێرا باوەڕمان هێناو (وتمان): پەروەدگارا؛ دەتۆش لەگوناهو هەڵەکانمان خۆش ببە، چاوپۆشی بکە لەکردارە ناپەسەندەکانمان و (لەسەر ڕێبازی) چاکان و (بەختەوەران) بمانمرێنە و لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە. * پەروەردگارا؛ ئەو بەڵێنانەشمان بۆ ئەنجام بدە کە لەسەر زاری پێغەمبەرانتدا بەئێمەت داوە (کە سەرکەوتنە لە دنیاداو بەهەشتی بەرینە لە داهاتوودا) و لە ڕۆژی قیامەتیشدا خەجاڵەت و ڕووزەردمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن شکێن نیت و بەڵێنی خۆت دەبەیتە سە( رضي الله عنه)}.

(١٤١) المؤمنون: ١٠٩ . {چونکە بە ڕاستی کاتی خۆی دەستەیەك لە بەندە ئیمانداره‌کانم دەیانوت؛ پەروەردگارا ئێمە ئیمان و باوەڕی دامەزراومان بە زاتی تۆ





(٥) ﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ (١٠٩) قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ۚ﴾(١٤٢)

پەروەردگار فێرمان دەکات کاتی پاڕانەوە بەناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی لێی بپاڕێینەوە، کەواتە چ نەزانینێکە و فێڵ لەخۆکردنێکە مرۆڤ پشت لەم فێرکردنە بکات!؟

---

هێناوە، دە، لێمان خۆش ببەو ڕەحممان پێ بکە چونکە تۆ چاکترین زاتێکی کە لە هەموو خاوەن ڕەحم و سۆزەکان میهرەبانتریت }

(١٤٢) ألإسراء: ١٠٩ - ١١٠ { ئەوانە سوژدە و کڕنووش دەبەن و دەگرین و ئەسرینی خۆشەویستی پەروەردگار لە چاوانیان دەبارێت، فرمێسکی ئیمان و شادی هەڵدەوەرێنن و تا دێت زیاتر ملکەچ و فەرمانبەردار دڵ پڕ لە ئیمان دەبن. * پێیان بڵێ: ئێوە لە نزاو دوعاتاندا هاوار لە (الله) بکەن، یان بەسیفەتی پیرۆزی (الرحمن) هانای بۆ بەرن، بەهەر ناوو سیفەتێکی جوان و بەرز هاواری لێبکەن و نزا بکەن دروستە، چونکە ئەو خاوەنی هەموو سیفات و ناوە پیرۆزو جوانەکانە، بەهەر سیفەتێك کە لەگەڵ داخوازیەکانتاندا گونجا، داوای لێ بکەن، لەکاتی داواکردنی ڕزق و ڕۆزیدا بە (یا ڕزاق، یا وهاب) لەکاتی داوای سەرکەوتندا بە (یا قوی یا متین یا عزیز یا ....هتد، ئەی ئیماندار) }

## شێوازی نۆیەمـــ( ٩ )ـ:

### پەرۆشکرنی موسڵمان بۆ دوعاکردن لە خودا به

### فێرکردنی ماناکانی تەوەسل بە گوفتار و ڕەفتارە چاکەکانی بەندەی دوعاکار

### ( الترغيب في الدعاء بالتوسل إلى الله بالأعمال الصالحة و تعظيم شعائره )

(١) ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾(١٤٣)

(٢) ﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ (١٤٤)

(٣) ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ١٩٣ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ (١٤٥)

---

(١٤٣) آل عمران: ١٦. { ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا، بەڕاستی ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە، دە لە گوناهەکانمان خۆش ببە و لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.}.

(١٤٤) آل عمران: ٥٣.{ (ئەوسا وتیان): پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەوەی داتبەزاندووە و ڕەوانەت کردووە، شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشتین، دە تۆیش لە ڕیزی شایەتەکانی (گەیاندنی بەرنامەکەتدا) تۆمارمان بکە}.

(١٤٥) آل عمران: ١٩٣ - ١٩٤.{ پەروەردگارا؛ بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێک بوو، بانگی کردین بۆ ئیمان و (دەیفەرموو): ئیمان بهێنن بە پەروەردگارتان جا ئێمەش (بێ دوودڵی)، خێرا باوەڕمان هێناو (وتمان): پەروەدگارا؛ دەتۆش لەگوناهو هەڵەکانمان خۆش ببە، چاوپۆشی بکە لەکردارە ناپەسەندەکانمان و (لەسەر ڕێبازی) چاکان و (بەختەوەران) بمانمرێنە و لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە * پەروەردگارا؛ ئەو بەڵێنانەشمان بۆ ئەنجام بدە کە لەسەر زاری پێغەمبەرانتدا بەئێمەت داوە (کە

(٤) ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ
ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ (١٤٦) .

(٥) ﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهٗاۖ وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ
ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ
أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ **إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ
وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ١٥** ﴾ (١٤٧) .

---

سەركەوتنە لە دنیاداو بەهەشتی بەرینە لە داهاتوودا) و لە ڕۆژی قیامەتیشدا خەجاڵەت و ڕووزەردمان مەكە، بێگومان تۆ بەڵێن شكێن نیت و بەڵێنی خۆت دەبەیتە سەر. }.

(١٤٦) المؤمنون: ١٠٩. {چونكە بە ڕاستی كاتی خۆی دەستەیەك لە بەندە ئیمانداره‌كانم دەیانوت؛ پەروەردگارا ئێمە ئیمان و باوەڕی دامەزراومان بە زاتی تۆ هێناوە، دە، لێمان خۆش ببەو ڕەحممان پێ بكە چونكە تۆ چاكترین زاتێكی كە لە هەموو خاوەن ڕەحم و سۆزەكان میهرەبانتریت.}.

(١٤٧) الأحقاف: ١٥.{ئێمە فەرمانمان بەئادەمیزاد داوەكە چاكەكارو چاك ڕەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوكیدا، دایكی بەئازارەوە هەڵی گرتووەو بەدەم ئێش و ئازارەوەبوویەتی، سک پربوون و لەشیر بڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندوون .. هەتا كاتێک ئینسان دەگاتە حاڵەتی توندوتۆڵی و توانایی و تەمەنی چڵ ساڵی ( ئەوسا ئیتر حەق وایە ئەم دۆعایە بكاتەیەكێک لەوێردەكانی سەر زاری و ) بڵێت : پەروەردگار !! كۆمەكیم بكەو یارمەتیم بدەتا شوكرانەبژێر و سوپاسگوزاری ئەو نازو نیعمەتانە بم كەبەمن و دایک و باوكمت بەخشیوە، هەروەها یارمەتیم بدەلەو جۆرە كاروكردەوەچاكانەئەنجام بدەم،كەتۆ پێی ڕازیت، داواكاریشم چاكەبڕوێنیت لەناو نەوەكانمدا لەبەر قازانجی خۆم ( چاكەی هەركەس بەشی دایک و باوكی تیادایە ) بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ، تا لەگوناهەكانم خۆش ببیت و من لەموسڵمانانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارم}.

(٦) ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴾[١٤٨] .

پەروەردگار فێرمان دەکات کاتی پاڕانەوە تەوەسل بە کردەوە چاکەکانمان بکەین وەکو ئیمان و نوێژ و گشت کردەوەیەکی چاك .

کەواتە چ بە هەدەردان و خەسارەتێکە مرۆڤ پشت لەم فێرکردنە بکات کارە چاکەکانی خواپەرستی نەخاتە گەڕ بۆ بەدەستهێنانی ئاواتەکانی لە کاتی پاڕانەوە لە خودا!؟

(١٤٨) إبراهيم : ٣٧ . {پەروەردگارا بەڕاستی من هەندێ لە وەچە و خێزانم لە دۆڵێکی وشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردووە، لەپاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا، لە پاڵ (بيت الحرام)دا، پەروەردگارا، بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن تا بەچاکی نوێژو خواپەرستی ئەنجام بدەن، جاداواکارم دڵی هەندێك لەو خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزی جۆراو جۆر بەهرەمەندیان بکەیت، بۆئەوەی سوپاسگوزاری بکەن}.

## شێوازی دەیەم( ١٠ )ـ:

### پەرۆشکرنی موسڵمان بۆ دوعاکردن لە خودا بە

### دوو شێوازە شەرعییەکەی تەوەسل لە هەمانکاتدا

### ( الترغيب في الدعاء بنوعي التوسل الشرعي في نفس الوقت ـ دلالة السياق ـ )

(١) ﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟
ٱلرَّحْمَـٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ
ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ (١٤٩)

| پێش باسی دوعاکردن لە ئایەتەکەدا (چاکەی سوجدە بردنی بەندە) | فەرمان بە دوعاکردن بە ناوە جوانەکانی خودا لە ئایەتەکەدا | پاش باسی دوعاکردن لە ئایەتەکەدا (گەورەیی ناو و سیفەتەکانی خودا) |
|---|---|---|
| ﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾﴾ | ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَـٰنَ ۖ﴾ | ﴿أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ |
| ستایشکردنی سوجدە بەران بۆ پەروەردگار پێش باسی دوعا ئاماژەیە کە دوعا لە سوجدەدا بکرێت(أقرب ما يكون العبد من ربه و هو ساجد) | فەرمانکردن بە پاڕانەوە لە پەروەردگار پاش ستایشکردنی سوجدەبەران ئاماژەیە بۆ زۆری دوعاکردن لە سوجدەدا | باسکردنی ناوە جوانەکانی خودا پاش باسی دوعا ئاماژەیە کە ئەم ناوانە بکرێنە وەسیلە لە کاتی دوعاکردن. |

(١٤٩) ألإسراء: ١٠٩ - ١١٠ .

(٢) ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾
ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ
فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ
ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾
رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾ (١٥٠)

---

(١٥٠) آل عمران: ١٩٠ - ١٩٤ .{ بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە ئاڵو گۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند... * ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەک، سەرنجی هەموو دیاردەیەک دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ * پەروەردگارا بەڕاستی تۆ هەرکەس بخەیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە ئیتر شەرمەزارو ڕیسواو خەجاڵەتت کردووە، (جا بێگومان لەوێ) ستەمکاران هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە. * پەروەردگارا؛ بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێک بوو، بانگی کردین بۆ ئیمان و (دەیفەرموو): ئیمان بهێنن بە پەروەردگارتان جا ئێمەش (بێ دوودڵی)، خێرا باوەڕمان هێناو (وتمان): پەروەدگارا؛ دەتۆش لەگوناهو هەڵەکانمان خۆش ببە، چاوپۆشی بکە لەکردارە ناپەسندەکانمان و (لەسەر ڕێبازی) چاکان و (بەختەوەران) بمانمرێنە و لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە. * پەروەردگارا؛ ئەو بەڵێنانەشمان بۆ ئەنجام بدە کە لەسەر زاری پێغەمبەرانتدا بەئێمەت داوە (کە سەرکەوتنە لە دنیاداو بەهەشتی بەرینە لە داهاتوودا) و لە ڕۆژی قیامەتیشدا خەجاڵەت و ڕوو زەردمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن شکێن نیت و بەڵێنی خۆت دەبەیتە سەر.}





نزیککردنی ماناکانی تەوەسل لەم ئایەتانەدا بە خشتەیەك :

| | | |
|---|---|---|
| گەورەیی سیفەتی فیعلی خودا کە دروستکردنی زەوی و ئاسمانان و جیاکردنەوەی شەو و ڕۆژە | چاکەی بەندە: * کە ئیمان هێنانە بە گەورەیی خوداو ناردنی پێغەمبەران و هەبوونی سزا و پاداشت، * زۆری بیرکردنەوە لە گەورەیی دروستکراوەکانی خودا و زۆر زکرکردنی خودا | دوعاکردن |
| الأسماء و الصفات(الخالق) | الأعمال الصالحة (القلبية و القولية) | الدعاء |
| ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾﴾ | ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا﴾ | ﴿رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾ |

شارەزایی لە چۆنیەتی پاڕانەوە وەکو چۆن خودا پێی خۆشە، مایەی وەڵامدانەوەیە .

لەو چۆنیەتیانەش کە خودای پەروەردگار پێیخۆشە بەندە پەیڕەوی بکات لە پاڕانەوەیدا، بریتین لە باسکردنی گەورەیی ناو و سیفەتەکانی خودا، و باسکردنی ملکەچی و پێویستی بەندە بۆ خودا.

## شێوازی یازدەم (١١)

### پەرۆشکرنی موسڵمان بۆ دوعاکردن لە خودا، بە دەرفەت وەرگرتن لە بارە ئیمانییە تایبەتەکان

### (الترغيب في الدعاء من الله بإستغلال الحالات الإيمانية)

(١) ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ ۖ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴾(١٥١)

(٢) ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾﴾(١٥٢)

(٣) ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾﴾(١٥٣).

پەروەردگار موسڵمان ئاگاداردەکاتەوە کە حاڵەتەکانی ئیمانبەرزی بە دوعاکردن برازێننەوە و بە هەدەرنەدەن.

---

(١٥١) آل عمران: ٣٨ . {ئا لەو کات و شوێنەدا، زەکەریا هانا و نزای بۆ پەروەردگاری لێ بەرز بۆوە و وتی: پەروەردگارا نەوەی چاک و پاکم پێ ببەخشە، بەڕاستی تۆ بیسەری دوعا و نزایت. }

(١٥٢) النساء: ١١٠ . {ئەوەی خراپەیەک بکات (دژ بەخەڵکی) یان ستەم لە خۆی بکات لەوەودوا (بەخۆیدا بچێتەوە) و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات، ئەوە خوایەکی لێخۆشبوو و میهرەبانی دەستدەکەوێت}

(١٥٣) لقمان: ٣٢ . {کاتێکیش لە دەریادا شەپۆلێک ئابڵوقەی هاوەڵگەرو کارەکان بدات، وەک کێوەکان گەورە بێت، ئەوە هاناو هاوار هەر بۆ خوا دەبەن زۆر بە دڵسۆزانە ملکەچن بۆ خوا، جا کاتێک فریایان دەکەوێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانگەیەنێتە وشکانی، جا هەیانە بەردەوام دەبێت لە سەر ڕێبازی ئیمان و دەمێنێتەوە لەسەر یەکتاناسینی خوای میهرەبان، (هەشیانە ڕێگەی نادروستی خۆی دەگرێتەوە)، جا کەس لە ئایات و بەڵگەکانی ئێمە نکول و پەیمان شکێنی ناکات جگە لە زۆردار و ناپاک و سپڵە.}

## شێوازی دوانزەم (١٢)

### پەرۆشکرنی موسڵمان بۆ دوعاکردن لە خودا، بە دەرفەت وەرگرتن لە کاتە پیرۆزەکان
### (الترغيب في الدعاء من الله بإستغلال الأوقات المباركة)

(١) ﴿وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ۝١٨﴾ (١٥٤).

(٢) ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ۝١٧﴾ (١٥٥).

(٣) ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ۝٦﴾ (١٥٦).

(٤) ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾(١٥٧)

پەروەردگار ئاگادارماندەکاتەوە کە بەیانیان، شەوان دوو کاتی تایبەتن پێویستە موسلمانان بە ئیستغفار و دوعا برازێننەوە و بە هەدەر مەدەن.

---

(١٥٤) الذاريات : ١٨ {...لەبەرەبەیانەکانیشدا داوای لێخۆشبوونیان لەپەروەردگاریان دەکرد (تا لێیان ببورێت) ...}

(١٥٥) آل عمران: ١٧ . { ...لە بەرەبەیانەکاندا داوای لێخۆشبوون (لە پەروەردگاریان دەکەن چونکە واهەست دەکەن کە وەک پێویست خواپەرستیان نەکردووە)}

(١٥٦) المزمل: ٦ .{ بەڕاستی خۆ پێگەیاندن لە شەودا قورسترە لە ڕووی کردارو باشترە لە ڕووی گوفتارەوە}

(١٥٧) السجدة: ١٦ .{ (ئەو ئیماندارە بەختەوەرانە) نێوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەو ڕێگەی گەرم و نەرما (واتە بەنوێژو خواپەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر)، هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان ڕوو بە پەروەردگاریانە لە خەشم و قین و دۆزەخی دەترسن، ئاواتی ڕەزامەندی و بەهەشتیان هەیە و لەو ڕزق و ڕۆزی و توانایی و زانیاریەی پێمەن بەخشیوون دەبەخشن}

## شێوازی سێزدەمـ( ١٣ )ـ:

**پەرۆشکردنی مرۆڤ بۆ دوعاکردن و پاڕانەوە تەنها لە خودا، بە خستنە ڕووی بەڵگەی مێژوویی لە سەر گەیشتنی دوعاکاران بە مەرامەکانیان بە دوعاکردن**

**( الترغيب في الدعاء من الله بذكر قصص من نجاهم الله و نصرهم وبلغهم مراميهم بالدعاء )**

(١) ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾(١٥٨)

(٢) ﴿۞ وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾﴾(١٥٩)

---

(١٥٨) الأنبياء: ٨٧ - ٨٨ .{ یادی (ذو النون)یش بکەرەوە (کە یونس پێغەمبەرە) کاتێک بە تووڕەیی‌یەوە ڕۆیشت، گومانی وابوو کە هەرگیز دنیای لێ تەنگ ناکەینەوە (بەڵام بە پێچەوانەی گومانەکەیەوە خوا خستیە ناو سکی نەهەنگەوە)، جا لە ناو تاریکیەکاندا، (تاریکای شەوو دەریا و ناوسکی نەهەنگەکەدا) هاوارو نزای لێ بەرز بۆوەو وتی: پەروەردگارا هیچ خوایەک نیە جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم (کاتێک بە بێ فەرمانی تۆ قەومەکەم بەجێهێشت).* ئێمەش بەهانایەوە چووین و ڕزگارمان کرد؛ لەو غەم و پەژارەو تەنگانەیەی کە تێی کەوتبوو، بەو شێوەیەش ئیمانداران ڕزگار دەکەین (کاتێک کە دەکەونە تەنگانەوەو هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنن) }

(٣) ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ ......
قَالَ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَىَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِى ثَمَٰنِىَ حِجَجٍ ۖ فَإِنْ أَتْمَمْتَ
عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ ۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ ۚ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾
....﴾ (١٦٠)

---

(١٥٩) الأنبياء: ٨٣ - ٨٤. { یادی - ئەیوب- یش بکە کاتێک هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری برد (دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورو درێژ نەخۆش کەوتبوو، جگە لەوە پێشتریش ماڵ و سامان ومنداڵەکانی تیاچوو بوون) وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی من ئازارو ناخۆشیم تووش بووە، تۆش لە هەموو کەس میهرەبانترو لە هەموو کەس دلۆڤانتریت.* جا ئێمە نزامان گیراکردو بەهاواریەوە چووین وهەموو ناخۆشی و نەخۆشیەکمان لە کۆڵ کردەوە، هەموو ماڵ و منداڵیمان پێبەخشیوە و ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا (دەکرێت خوای گەورە هەر هەمان ماڵ و منداڵی پێشووی بۆ زیندوو کردبێتەوە، یاخود نەوەی نوێی پێبەخشیبێت)، ئەوە ڕەحمەتێکی تایبەتی بوو لە لایەن ئێمەوە، یاداوەریشە بۆ بەندە خواپەرستەکان (کە ئەگەر ئەوانیش تووشی بەڵاو ناخۆشی بوون وەک ئەم، لەوەودوا نزایان کرد، خوای میهرەبان بە هاناو هاواری ئەوانیشەوە دەچێت)}

(١٦٠) القصص: ٢٤، ٢٧{ موسا مەردانە، شوانەکانی بڕدا و ماڵاتەکەیانی ئاودا و بەڕێی کردن، دوایی پشتی تێکردن و چووە ژێر سێبەرەکە و نزای کردو وتی: پەروەردگارا بەڕاستی تۆ خێرو بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵام هێشتا هەژارم و ئاتاجی بەخششی زیاترم *..... وتی: من پێم چاکە بتکەم بە کوڕی خۆم، بە زاوای خۆم، یەکێك لەم دوو کچەت لێ مارە بکەم بەمەرجی ئەوەی هەشت ساڵ لای من کار

(٤) ﴿۞ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ۝٩ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي
مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ۝١٠ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ۝١١ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى
ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ۝١٢ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ۝١٣ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً
لِّمَن كَانَ كُفِرَ ۝١٤ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ۝١٥ ﴾ (١٦١)
(٥) ﴿وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ۝٧٥ .........﴾ (١٦٢)

---

بکەیت، خۆ ئەگەر دە ساڵیشت بردە سەر ئەوەچاکەی خۆتە، منیش نامەوێت بێزارت بکەم و زۆرت بۆ بهێنم، دەمبینیت ئەگەر خوا بیەوێت لە چاکان دەبم؟}

(١٦١) القمر: ٩ - ١٥ .( پێش ئەمانیش قەومی نوح بروایان بەبەندەی بەرێزی ئێمە نەکردو وتیان: شێتە، زۆریش پیاهەڵشاخان و دژایەتی کرا * (ئەویش دوای (٩٠) ساڵ هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی: خوایە، بەڕاستی من شکستم خواردووەو سەرکەوتنم پێ ببەخشە * ئەوسا ئیتر ئێمە دەروازەکانی ئاسمانمان هاوڕێ لەگەڵ ئاوێکی خوڕدا کردوە* هەموو زەویشمان کرد بەکانیاو و ئاومان لێ هەڵقوڵاند، ئیتر ناوی ئاسمان و زەوی بەتەقدیرو ویستی خوا بەیەک گەیشتن، بەڕاستی بڕیاری لەسەر درابوو* ئەوسا نوح (علیه السلام)مان لەسەر چەند تەختەو بزمارێک هەڵگرت (مەبەست کەشتیەکەیە) * لەژێر چاودێری خۆماندا (لەناو ئەو زریانە سامناکەدا) دەهات و دەچوو، ئا بەو شێوەیە پاداشتی ئەو کەسەمان دایەوە کەبڕوای پێ نەکرا (واتەنوح) * بەڕاستی ئێمە ئەم بەسەرهاتەمان هێشتەوە بەبەڵگە بۆ هەموو نەوەکان...ئایا کەسێک هەیە کەپەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرێت ؟!)

(١٦٢) الصافات:٧٥. {بێگومان نوح هانا و هاواری بۆ هێناین، ئێمەیش چاکترین فریاد ڕەسێک بووین کە بەهانا و هاواریەوە چووین.}

(٦) ﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٣٣ فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٣٤﴾ (١٦٣)

(٧) ﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ﴾ (١٦٤)

ئەم چەند ئایەتە و دەیان ئایەتی دیکەش باس لە ڕزگاربوونی پێغەمبەران دەکەن (علیهم السلام):

* یونس (علیه السلام) لە زگی نەهەنگدا بۆ سەربەستی.

* ئەیوب (علیه السلام) لە مەینەتی نەخۆشییەوە بۆ لەش ساغی.

---

(١٦٣) یوسف: ٣٣ - ٣٤. { یوسف کەئەمەی بیست وتی: پەروەردگارم من زیندانم لەلا خۆشەویستره لەوەی کە ئەوان بانگم دەکەن بۆی، خۆ ئەگەر لە فێڵ و تەڵەکەی ئەوانە ڕزگارم نەکەیت و پیلان و نەخشەکانیان دەربازم نەکەیت و لام نەدەیت،لەوانەیە منیش مەیلم بۆ دروست ببێت و ئارەزوویان بکەم پاشان بچمە ڕیزی نەفام و گوناهبارانەوە.* جا پەروەردگاری بە هانایەوە چوو نزاکەی گیرا کردو لە تەڵەکە و فێڵی ژنان پاراستی و لایدا، چونکە بەڕاستی هەر ئەوزاتە بیسەری نزاکانە و زانایە (بە دڵ و دەروونەکان)}.

(١٦٤) البقرة: ١٤٤ .{ (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسورانی ڕووخسارت ڕوو بەئاسمان دەبینین (کە بە هیوای ڕووگەیەکی تایبەتیت، ئێمەش ئاگاداری نیازی دڵت بووین) سوێند بەخوا ئێمەش ڕووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەك پێی ڕازی و خۆشنود بیت، دە ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (المسجد الحرام) و ئێوەش ئەی موسوڵمانان لە هەر کوێ بوون، بەرەو لای ئەوێ ڕووتان وەربچەرخێنن}

* موسی (علیه السلام) لە هەژاری و بێکارییەوە بۆ کار و خێزانداری.

* نوح (علیه السلام) لە بێ دەسەڵاتییەوە بۆ سەرکەوتن بەسەر موشریکەکان.

* یوسف(علیه السلام) لە شەهەواتی ماددییەتەوە لە قەصری عەزیز بۆ حەسانەوەی ڕۆح لە زینداندا.

ئەم ئاواتانەش (سەربەستی، لەش ساغی، دەوڵەمەندی، سەرکەوتن، ئارامی ڕۆح ) گشتیان لە ڕێگای پاڕانەوە لە خوداوە بەدەست هاتوون. ئەمانە و گشت ئەم ئایەتانەی لەم بابەتەدا دێنە بەرچاومان ئاماژە و هاندانن بۆ مرۆڤ کە ڕێگای پاڕانەوە لە خودا بگرێتەبەر بۆ وەدەست هێنانی ئاواتەکانی دونیا و قیامەت، خەسارەتمەند تەنها ئەوەیە بۆ گەیشتنی مەرامەکانی هەموو نەخشەیەك دابڕێژێت و دوعا نە کات! یان دوعا لە بێجگەلەخودا بکات.

## شێوازی چواردەمـ( ١٤ )ـ:

### ترساندنی مرۆڤ لە تاوانی پشت کردن لە پاڕانەوە لە خودا

### ( الترهيب من الإعراض عن الدعاء من الله )

(١) ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾(١٦٥)

(٢) ﴿قُلۡ مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ فَقَدۡ كَذَّبۡتُمۡ فَسَوۡفَ يَكُونُ لِزَامَۢا﴾(١٦٦)

ئەگەر کردنی شتێك جێ ی پاداشتی خودا و سەرکەوتنی دونیا بێت و نەکردنی جێی توڕەیی خودا و سزا بێت، ئەوا چۆن موسڵمان پشتی تێدەکات! و ئەگەر کەسێك کوێرانە چاوی لە پاداشت نەبێت، چۆن ژیرانە لە سزا ناترسێت!

---

(١٦٥) غافر:٦٠.{ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن؛ ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە}.

(١٦٦) الفرقان :٧٧. {تۆ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ: (خەڵکینە پەروەردگارم هیچ گوێتان پێ نادات و نرختان بۆ دانانێت، ئەگەر دوعاو نزاو خواپەرستیتان نەبێت، کەچی زۆربەتان هەر پێغەمبەر و قورئانتان بە درۆزانی، ئەگەر بەردەوام وابن، ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لە ئایندەدا یەخەتان پێ دەگرێت لە کۆڵتان نابێتەوە.}

## شێوازی پازدەمـ( ١٥ )ـ:

### ترساندنی مرۆڤ لە تاوانی پاڕانەوە لە کەسێك یان شتێك لەگەڵ پاڕانەوەی لە خودای پەروەردگار
### ( الترهيب من أن تدعو مع الله غير الله )

(١) ﴿فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ ﴾ (١٦٧) .

(٢) ﴿وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ ﴾ (١٦٨) .

ئەگەر کەسێك لەگەڵ پاڕانەوەی لە خودا لە شتێکی دیکەش پاڕاوە وەکو بتێك یان قەبری کەسێکی مردوو یان هەر شتێکی دیکە، ئەوا پشتی لە یەکخوداپەرستی کردووە بۆ کوفر و هاوبەشی دانان بۆ خودا. ئەی ئەگەر کەسێك تەنها لە بێجگەلە خودا بپاڕێتەوە و لە خودا نەپاڕێتەوە! ئەمە کوفرێکی تاریکترە.... خودا بمان پارێزێت.

---

(١٦٧) الشعراء: ٢١٣ {کەواتە ئەی ئیمانداران، لەگەڵ خوادا هانا و هاوار بۆ بەناو خوایەکی تر مەبە، چونکە بەهۆی ئەوەوە تۆش لە سزا دراوان دەبیت}

(١٦٨) المؤمنون: ١١٧ {ئەو کەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شەریکی خوا، لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە، ئەوە بە ڕاستی حساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگاریتی، بێگومان بێ باوەڕو خوا نەناسان سەرفراز نابن}

## شێوازی شانزەمـ( ١٦ )ـ:

### ترساندنی دوعاکار لە بێجگە لە خودا، بە سزایەك لە جۆری تاوانەکەیان لە دۆزەخدا

### ( ترهيب الداعي من غير الله بعقوبة في النار من جنس عمله )

(١) ﴿وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ١٣ لَّا تَدۡعُواْ ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا ١٤﴾ (١٦٩).

(٢) ﴿وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ١٠ فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ١١ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ١٢﴾ (١٧٠).

(٣) ﴿قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ٥٠﴾ (١٧١).

---

(١٦٩) الفرقان: ١٣ - ١٤ { هەرکاتێک ئەوانە بە کۆت و زنجیرەوە فڕێ دەدرێنە ناو شوێنێکی تەنگەبەرەوە لە دۆزەخدا، داوای مەرگ و تیاچوون دەکەن و مردن بە ئاوات دەخوازن لەوێ. * (ئەوسا پێیان دەوترێت) ئەمڕۆ داوای تەنها مردنێک مەکەن، بەڵکو داوای مردنی زۆر بێ شومار بکەن و ئاواتی بۆ بخوازن!}

(١٧٠) الإنشقاق: ١٠ - ١٢ { (بەڵام) ئەوەی دۆسیەی کردەوەکانی لە پشتیەوە درایە دەستی* ئەوە لەمەولا هاوارو دادی لێبەرزدبێتەوە و دەڵێت: خوایە مەرگ، خوایە بمکوژە، خوا لەناوم بەرە* دەخرێتە ناو دۆزەخ}

( ١٧١) الغافر: ٥٠ {ئەوانیش لە وەڵامی داخوازیەکەیاندا دەڵێن: باشە، مەگەر پێغەمبەرەکانتان بە بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکراوە، ڕەوانە نەکرابوون بۆتان؟ هەمووان بەیەکدەنگ دەڵێن: بەڵێ، ڕاستە، ئینجا فریشتەکان دەڵێن: دەی کەوابوو هەر داوابکەن وبپاڕێنەوە، بێگومان داخوازی و پاڕانەوەی کافران بەهیچ ناچێت، تازە هیچ نرخێکی نیەو گیرا نابێت}

(٤) ﴿وَنَادَوْاْ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّـٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾﴾ (١٧٢) .

(٥) ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّـٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾﴾ (١٧٣) .

لە بەرئەوەی لە دونیادا هاواری خودایان نەکردووە، لە دۆزەخدا سزای ئەمە وەردەگرن بە هەوارکردنیك کە حەسرەت بێت و هیچ وەڵامێکی نەبێت.(العقوبة من جنس العمل) هەر بەم مانایەش ئەوانەی هەواری بەرد یان مردویان کردووە لەگەڵ بەردەکانی دۆزەخ دەسوتێنرێن و سزا دەدرێن: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُۖ أُعِدَّتْ لِلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾. واتە: خۆتان لە ئاگرێك بپارێزن کە سوتێنراوەکەی خەڵك و بەردن، بۆ کافرەکان ئامادەکراوە.

---

( ١٧٢) الزخرف: ٧٧ {دۆزەخیەکان هاوار دەکەن، ئەی مالك (کە فریشتەی سەرپەرشتیارە): دەبا پەروەردگارت بمانکوژێت، دەبا بمرین و کۆتایی بەم سەغڵەتیەمان بێت، لە وەڵامدا دەڵێت: بەڕاستی ئەوە جێتانە و تیایدا بۆ هەمیشە دەبێت بمێننەوە }.

(١٧٣) کهف: ٢٩ . { پێیان بڵێ: حەق هەر ئەوەیە کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانەکراوە، جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافرو بێ باوەڕ بێت، بێگومان ئێمە دۆزەخێکمان ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران کە لە هەموولایەکەوە دەورەیان دەدات و دیواری بڵێسەی ئابڵوقەی داون، خۆ ئەگەر هاوار بکەن لە ئازارو تینویەتیدا، ئەوە ئاو دەدرێن بە ئاوێکی گەرمی پیس و بۆن ناخۆش کە وەکو خڵتەی کانزایی تواوە وایە، ئەوەندەش گەرمە دەم و چاویان هەڵدەکورزێنێت و دەیبرژێنێت، ئای کە چەند خواردنەوەیەکی تاڵ و ناخۆشە، چەندە جێگەو ڕێگەیەکی پڕ لە ئازارە.}





## شێوازی حەڤدەمـ (١٧)ـ:

### دیمەنەكانی قیامەت لە قورئانی پیرۆزدا ،

### پێگەی فێركردنن لەم دونیایەدا بۆ تەنها پاڕانەوە لە خودای پەروەردگار.

### (مشاهد القيامة معالم لتعليم الناس في الدنيا بأن لا يدعوا مع الله أحدا)

(١) ﴿وَقِيلَ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۚ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾﴾(١٧٤).

(٢) ﴿وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾﴾(١٧٥).

(٣) ﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾﴾(١٧٦)

---

(١٧٤) قصص: ٦٤ . { ئەوسا پێیان دەوترێت: ئادەی هاوەڵانتان و خواكانتان بانگ بكەن، جا ئەوانیش بانگیان دەكەن، بەڵام وەڵام و بەدەمەوە چوون نەبوو بۆیان، ئەو كاتە سزای سەختی دۆزەخ دەبینن، ئاوات دەخوازن كە خۆزگە بەڕاستی ئەوان ڕێبازی هیدایەتیان بگرتایەتە بەر.}

(١٧٥) كهف: ٥٢. {ڕۆژێك دێت كە خوا لە هاوەڵگەران دەپرسێت و پێیان دەڵێت: كوا ئەو شەریك و هاوەڵانەی كە بۆ منتان بڕیار دەدا، جا بانگیان لێ دەكەن و هاواریان لێدەكەن، (بەڵام بێ سوودە) هەر وەڵامیشیان نادەنەوە، ئیتر بۆ هەمیشە سزای سەخت دەخەینە نێوانیانەوە.}





ئەم ئایەتانە دیمەنی قیامەتن کە بە موشریکەکان دەگوترێت بڕۆن داوا لەو کەس و شتانە بکەن کە لە دونیادا هاوارتان بۆ دەبردن، با بە هاناتانەوە بێن، بۆ ئەوەی حەسرەت بخۆن، چونکە ئەوکات ڕاستییەکان بۆیان دەبێتە واقعێکی بەڵگە نەویست، کە تەنها خودا بەهانای ئەوکەسەوە دێت کە لێی دەپاڕێتەوە و تەنها خودا پەناگەیە بۆ ئەوکەسەی پەنای بۆ دەبات، ئەمانەش هەرگیز لە دونیادا لە خودا نەپاڕاونەتەوە و هەرگیز پەنایان بۆ نەبردووە، ئیستاش دەرفەتەکەیان لە دەست چووە و بۆیان ناگەڕێتەوە، چونکە لەسەر شیرك و پەنابردن بۆ بێجگەلە خودا مردوون...

ئەم دیمەنانەش پێگەی فێرکردنی موسڵمانن کە تەنها لە خودا بپارێنەوە.

---

(١٧٦) الأنعام: ٤٠ - ٤١ {(بە خوانەناسان) بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر سزاو تۆڵەی خوا یەخەتان پێبگرێت، یان قیامەت یەخەتان پێ بگرێت، (ئا لەو کاتانەدا) هاناو هاوار بۆ کەسێک دەبەن جگە لە خوا؟ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن کە غەیری خوا فریاتان دەکەوێت؟! ❋(نەخێر لەوکاتە سامناکانەدا) هەر هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە دەبەن (ئەویش خوایەکی میهرەبانە) بەڵاو ناخۆشیەکانتان لەسەر لادەبات ئەگەر بیەوێت، جا لەوکاتەدا هەر شتێک کە بە هاوەڵ شەریکی ئەو زاتەی دادەنێن، فەرامۆشی دەکەن}





## شێوازی هەژدەمـ(١٨)ـ:

### بەیانکردنی قورئانی پیرۆز کە پاڕانەوە لە خودا مەبەستە لە ژیان

### (بيان القرآن الكريم بأن الدعاء من الله دون غيره هو المقصود من الحياة)

(١) ﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًۢا﴾(١٧٧) .

(٢) ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَـٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَـٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾(١٧٨)

ئایەتەکان باس لەوەدەکەن بەهای مرۆڤ لای خودا پاڕانەوەیەتی لە خودا، کەواتە ئەگەر ئەم پاڕانەوەیە نەهێتە جێ لە دونیادا ژیان مەبەستی نامێنێ و مرۆڤ بەهاکەی لە دەست دەدات.

---

(١٧٧) الفرقان :٧٧. {تۆ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ: (خەڵکینە) پەروەردگارم هیچ گوێتان پێ نادات و نرختان بۆ دانانێت، ئەگەر دوعاو نزاو خواپەرستیتان نەبێت، کەچی زۆربەتان هەر پێغەمبەر و قورئانتان بە درۆزانی، ئەگەر بەردەوام وابن، ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لە ئایندەدا یەخەتان پێ دەگرێت لە کۆڵتان نابێتەوە.}

(١٧٨) الأنعام : ٤٢ - ٤٣. {سوێند بێت بێگومان ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی زۆرمان ڕەوانە کردووە بۆ سەر قەوم و گەلانی تر (جا کاتێک سەرکەش و یاخی بوون)، تووشی تاڵاوی جەنگ و بەڵاو تەنگانەمان کردن بۆ ئەوەی لێمان بپاڕێنەوەو بلاڵێنەوە. * ئەوانە کاتێک تۆڵەو سزای ئێمەیان بۆ هات، بۆ نزاو پاڕانەوەی بەکوڵیان نەکرد، بەڵام دڵیان ڕەق و ڕەش بوو، شەیتانیش ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانەی بۆ ڕازاندبوونەوە کە دەیانکرد. }





## شێوازی نوزدەمـ( ١٩ )ـ:

### بەیانکردنی قورئانی پیرۆزکە پاڕانەوە لە خودا ڕێزدارییە بۆ مرۆڤــ

### (بيان القرآن الكريم بأن الدعاء من الله هي قيمة المؤمن و سموه )

(١) ﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَآؤُكُمْۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامَۢا﴾(١٧٩)

(٢) ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾﴾(١٨٠)

---

(١٧٩) الفرقان :٧٧. {تۆ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ: (خەڵکینە) پەروەردگارم هیچ گوێتان پێ نادات و نرختان بۆ دانانێت، ئەگەر دوعاو نزاو خواپەرستیتان نەبێت، کەچی زۆربەتان هەر پێغەمبەر و قورئانتان بە درۆزانی، ئەگەر بەردەوام وابن، ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لە ئایندەدا یەخەتان پێ دەگرێت لە کۆڵتان نابێتەوە.}

(١٨٠) کهف: ٢٨ .{ ئارام بگرەو خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەرزاریانە لە بەرەبەیان و دەمەو ئێواراندا، مەبەستیانەو دەیانەوێت کە ئەو زاتە لە خۆیان ڕازی بکەن، ڕوو لەوان وەرمەگێڕەو (ڕوو مەکە دنیاپەرستان و دەوڵەمەندان) لەکاتێکدا تۆ زینەت و ڕازاوەیی ژیانی دنیات بوێت و بەگوێی ئەوجۆرە کەسە مەکە کە دڵیمان غافڵ کردووە لە یادی خۆمان (بەهۆی دنیاپەرستیەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووەو هەرچی کاروباری هەیە بێ سەرو بنەو لە سنوور دەرچووە.}

(٣) ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾﴾ (١٨١)

(٤) ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾﴾ (١٨٢)

ئایەتەکان مەدح و ستایشی ئەوانە دەکەن کە دوعاکارن و پەنا بۆ خودا دەبەن، کەواتە لای خودا ئەمە خاڵی ڕێزداری مرۆڤە نەك شتێکی دیکە، ئەگەر مرۆڤ ئەم خاڵە نەهێنێتەدی لە ژیانیدا، ئەوا هیچ بەهایەکی لای خودا نامێنێت.

---

(١٨١) الأنعام: ٥٢ {(ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندار) نەکەیت ئەوانە دەربکەیت (لە مزگەوت و کۆڕی خواناسین) کە لە بەیانیان و ئێواراندا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و (دەیپەرستن) مەبەستیشیان تەنها ڕەزامەندی ئەوە، حساب و لێپرسینەوەی هیچ شتێکی ئەوان لەسەر تۆ نیە و حساب و لێپرسینەوەی هیچ شتێکی تۆیش لەسەر ئەوان نیە، دەرکردنی تۆ بۆ ئەو موسڵمانانە دەبێتە هۆی ئەوەی تۆ بچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە.}.

(١٨٢) السجدة : ١٦ { (ئەو ئیمانداره بەختەوەرانە) نێوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەو ڕێگەی گەرم و نەرما (واتە بەنوێژو خواپەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر)، هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان ڕوو بە پەروەردگاریانە لە خەشم و قین و دۆزەخی دەترسن، ئاواتی ڕەزامەندی و بەهەشتیان هەیە و لەو ڕزق و ڕۆزی و توانایی و زانیاریەی پێمەن بەخشیوون دەبەخشن}

## شێوازی بیست(٢٠)ـ:

**بەیانکردنی قورئانی پیرۆز کە دوعاکار لە بێجگەلەخودا بێ ڕێزە و شیاوی قسە پێگوتنە لای خەڵکەوە، ئەگەر لە ترسی وەڵامە نەفامەکەی نەبێت.**

**(بيان القرآن بأن الداعي من غير الله مذلولٌ جهول مستحقٌ لسب لولا مانع خشية رده جهلا)**

(١) ﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَآؤُكُمْۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾[(١٨٣)]

(٢) ﴿وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدْوًاۢ بِغَيْرِ عِلْمٍۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٠٨﴾[(١٨٤)]

بێڕێزی ئەوکەسەی کە لە خودا ناپاڕێتەوە لەم دونیایەدا بە ئاستێکە کە پێویستە قسەی پێبگوترێت، بەڵام چونکە نەفام و جاهیلە با موسڵمانان قسەی پێمەڵێن، تاوەکو لە زمانە خراپەکەی ئەو پارێزراوبن .

---

(١٨٣) الفرقان :٧٧. {تۆ ئەی محمد صلی الله علیه وسلم پێیان بڵێ: (خەڵکینە) پەروەردگارم هیچ گوێتان پێ نادات و نرختان بۆ دانانێت، ئەگەر دوعاو نزاو خواپەرستیتان نەبێت، کەچی زۆربەتان هەر پێغەمبەر و قورئانتان بە درۆزانی، ئەگەر بەردەوام وابن، ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لە ئایندەدا یەخەتان پێ دەگرێت لە کۆڵتان نابێتەوە.}

(١٨٤) الأنعام: ١٠٨ {(ئەی ئیمانداران) نەکەن جوێن بدەن بەو بت و شتانەی کە (نەفامان) هاواری لێدەکەن و دەیپەرستن بێجگە لەخوا، نەوەکو ئەوانیش بەناحەق و بەنەفامی جوێن بدەن بەخوا، (چونکە ئەوانە) نایناسن و قەدری نازانن، ئا بەو شێوەیە ئێمە بۆ هەر گەل و ئوممەتێک کردەوەکەیانمان ڕازاندۆتەوە، لەوەودوا گەڕانەوەیان هەر بۆ لای پەروەردگاریانە، ئەوسا ئاگاداریان دەکاتەوە بەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد}

## شێوازی بیست و یەک( ٢١ )ـ:

### ڕووبەروو بوونەوەی ئەو کەسانەی هاناو هاوار بۆ بێجگە لە خودا دەبەن بە دەرئە نجامەکان
### ( الإنكار على الداعين من غير الله بإسلوب التحدي و طلب النتائج )

(١) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ۖ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۗ قُلِ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ﴾ (١٨٥)

(٢) ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا﴾ (١٨٦)

---

(١٨٥) الأعراف : ١٩٤ - ١٩٥. { بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان لێدەکەن جگەلە خواو لێیان دەپاڕێنەوە، چەند بەندەیەکی وەک ئێوەن (هیچیان بەدەست نیە) دە هاواریان لێ بکەن، بابێن بەدەمتانەوە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (لەو داوایەتاندا).* ئایا ئەو پەرستراوانە قاچیان هەیە پێی بڕۆن بەڕێوە؟ یان دەستیان هەیە ڕای بوەشێنن و ئازاری نەیارەکانی پێ بدەن؟ یاخود چاویان هەیە پێی ببینن؟ یاخود گوێیان هەیە پێی ببیستن؟ ئەی محمد(صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: داوا لە پەرستراوەکانتان بکەن و چیتان لە دەست دێت لە پیلان گێڕان بیکەن و مۆڵەتم مەدەن... }.

(١٨٦) الإسراء : ٥٦. { ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هاوەڵگەران بڵێ: ئادەی هاناو هاوار بکەن لەو بت و شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن (ئایا هیچیان لە دەست دێت؟ دڵنیابن کە ئەوانە) نە دەتوانن بەڵاو ناخۆشیەکتان لەسەر لابەرن. نەدەتوانن بارودۆخ بگۆڕن}.





(٣) ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِۖ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ﴾(١٨٧)

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا ئەوانەی هاوار بۆ بێجگەلە خودا دەبەن، بە بەڵگەیەکی عەقلی ئاگادار دەکرێنەوە ئەویش ئەوەیە با ئێستا پەنایان بۆ بەرن تاوەکو بزانن ئەمانە هەرگیز بە هانایانەوە ناهێن، دار و بەرد و مردووی بێدەستەڵاتن و نابیناو نابیستەن، چۆن بەهانای کەسێکەوە دێن! دە با بانگیان بکەن ...

(١٨٧) سبأ:٢٢. {(ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە هاوەڵپەرستان) بڵێ: با هاناو هاوار ببەن بۆ ئەو شتانەی کە لەجیاتی خوا (دەیانپەرستن)!! (ئەوانە) خاوەنی بچوکتر لە ئەتۆمێك نین نە لە ئاسمانەکان، نە لە زەویدا، وەهیچ هاوبەشی و هاوکاریەکیشیان نیە تیایاندا، دەسەڵاتی هیچ پشتیوانی و یارمەتیەکیشیان نیە}.

## شێوازی بیست و دوو ( ٢٢ ):

### ئینکارکردنی پاڕانەوە لە بێجگەلەخودا بەشێوازی تەعەجوب

### ( الإنكار على الداعين من غير الله بإسلوب التعجب )

(١) ﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴿١٢٥﴾﴾ (١٨٨) !

ئایەتەکە باسی سەرسامی پێغەمبەرێك دەکات، چۆن دەبێت کەسێك کە خودای پەروەردگار عەقل و هۆشی پێی بەخشی بێت، ئەوەندە خۆی نەفام بکات داوا لە دار و بەرد و بت بکات!! و پشت لە داواکردن بکات لەو خودایەی کە ئەوەی لە زەوی و ئاسماناندا بێت داوا و پاڕانەوەی لێدەکەن: ﴿يَسْأَلُهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾!!

(٢) ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾﴾ (١٨٩) .

ئایەتەکە ئاگادارکردنەوەیە کە هەر داواکارێك لە بێجگە لە خودا، داواکارییە لە شەیتان، کە هەرگیز خێر و چاکەی بۆ مرۆڤ نە ویستووە، کەواتە چۆن خوازراوەکانی پێی دەبەخشێت!!

---

(١٨٨) الصافات: ١٢٣ - ١٢٥ . { بێگومان - ئیلیاس - یش لە دەستەی پێغەمبەران و ڕەوانە کراوانە (لە لایەن ئێمەوە) * ئەوکاتە ئەویش بە قەوم و گەلەکەی خۆی وت: ئەوە ناکرێت خواناس بن؟ ئەوە بۆ لەخوا ناترسن؟! * ئایا ئێوە هاناو هاوارو نزا بۆ - بەعل - دەبەن (بتێکی گەورە بوو دەیانپەرست) وە واز لە خواپەرستی دەهێنن لەکاتێکدا ئەو زاتە چاکترینی دروستکارەکانە.}

(١٨٩) النساء: ١١٧ {(ئەو هاوەڵگەرانە) ئەوەی هاناو هاواری بۆ دەبەن و دەیپەرستن - جگە لەخوا - چەند پەرستراوێکی کار تێکراون (پەرستراو دەبێت کارتێکەر بێت نەک کارتێکراو، بۆیە بتەکانیان بەمێینە ناوناوە وەک: لات و عوززا)، تەنها هاناو هاواریشیان هەر بۆ شەیتانی سەرکەش و یاخی یە کە لە هەموو خێرێک داماڵراوە.}

## شێوازی بیست و سێ (٢٣)ـیەم:

### نەهی کردن لە پاڕانەوە لە بێجگەلەخودا بە شێوازی ئیخباری

**(النهي عن الدعاء من غير الله بأسلوب الإخبار)**

(١) ﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهۡوَآءَكُمۡ قَدۡ ضَلَلۡتُ إِذٗا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ٥٦﴾ (١٩٠).

(٢) ﴿۞قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٦﴾ (١٩١).

(٣) ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا ٢٠﴾ (١٩٢).

ئایەتەکان باسی ڕاشکاوی حاڵی پێغەمبەرانە (عليهم السلام) بەرامبەر موشریکەکان، کە باس لە حاڵی خۆیان دەکەن و پێیان ڕادەگەیەنن ئیمە بانگەوازەکەمان تەنها پاڕانەوەیە لەخودا و دوورکەوتنەوەیە لە هەموو شتێك کە دەپەرسترێت و داوای لێدەکرێت بێجگە لە خودا..

---

(١٩٠) الأنعام : ٥٦ { (بەبێ باوەڕان) بڵێ: بەڕاستی من قەدەغە کراوم لە پەرستنی ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن لە غەیری خوا (هەروەها) بڵێ: من شوێن ئارەزووەکانی ئێوە ناکەوم (ئەگەر وابکەم)، ئەوە ئیتر بێگومان ئەو کاتە من سەر لێشێواو دەبم و هەرگیز لە هیدایەت دراوان نیم}.

(١٩١) غافر: ٦٦. { ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: بێگومان من قەدەغەم لێکراوە ئەو شتانە بپەرستم کە ئێوە لە جیاتی خوا هانا و هاواری بۆ دەبەن، لە کاتێکدا بەڵگە و نیشانەی زۆر ئاشکرام لە لایەن پەروەردگارمەوە پێگەیشتووە و من فەرمانم پێ دراوە بە ملکەچی خۆم بدەمە دەست پەروەردگاری هەموو جیهانیان}

(١٩٢) الجن :٢٠ { پێیان بڵێ: من هەر بەردەوام دەبم و هەر بانگەواز دەکەم بۆ لای پەروەردگارم، کەسیش ناکەمە هاوەڵ و شەریکی.}

## شێوازی بیست و چوار ـ( ٢٤ )ـ:

### ڕاشکاوی نەهی کردن لە وەی کەسێك دوعا لە بێجگە لە خودا بکات.

### ( صراحة النهي عن الدعاء من غير الله )

(١) ﴿وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾ (١٩٣) .

(٢) ﴿وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ (١٩٤) .

ڕاشکاوی بانگەوازی پێغەمبەران (عليهم السلام) کە داواکاری تەنها لە خودا دەکرێت، هەروەك سوجدەبردن تەنها بۆ ئەو ڕەوایە، هیچ شێك شایستە نییە لەگەڵ خودا لێی بپاڕێیتەوە، چونکە حوکم لەدەست خودایە و بێجگە لە خودا هەموو شتێك لە ناودەچێت، هەموومانیش بۆی دەگەڕێینەوە.

---

(١٩٣) الجن : ١٨. {دڵنیابن کە: مزگەوتەکان تایبەتی خوای گەورەن، دەبێت هەر ئەوەی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نەکرێتە شەریك و هاوتای ناوی ئەو زاتە.}

(١٩٤) القصص : ٨٨ . {لەگەڵ خوادا هانا و هاوار لە خوایەکی تر مەکە، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، هەرچی شت هەیە تیاچووە لەناوچووە جگە لەو زاتە، فەرمانڕەوایی هەر شایستەی ئەوە، هەموانیش هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە.}

## شێوازی بیست و پێنجـ( ٢٥ )ـ:

### لە قورئانی پیرۆزدا پاڕانەوە تەنها لە خودا سیفەتی ( عباد الرحمن )ە

### ( الدعاء من الله دون غيره من صفات عباد الرحمن )

(١) ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَـٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَـٰمًا
﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ
إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ
يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٲلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ
ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٲلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾ (١٩٥)

ئایەتەكە باس لە سیفاتی بەندەكانی خودا دەكات لەو سیفاتانەش: ئەمانە تەنها داواكاری لە خودا دەكەن و بێجگەلە خودا لە كەس ناپاڕێنەوە.

---

(١٩٥) الفرقان : ٦٣ – ٦٨{بەندەكانی خوای میهرەبان ئەو كەسانەن كە زۆر بە هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، كاتێكیش نەفامان بە قسە و قسەڵۆكی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو (ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن). * ئەوانەی كە شەوگار بۆ پەروەردگاریان بە سوژدە و وەستاون و نوێژ دەبەنە سەر. * ئەوانەی كە دەڵێن: پەروەردگارا، لەسزای ئاگری دۆزەخ بەدوورمان بكە و پەنامان بدە، چونكە سزاو ئازاری لە كۆڵ نابێتەوە و بەردەوامە (بۆ ئەوكەسەی خوانەناس و یاخیە).* بەڕاستی ئەو دۆزەخە شوێن و نیشتەجێیەكی زۆر ناخۆش و ناسازە (ئاهو ناڵەو پەشیمانی بێ سنوورە تیایدا). (هەروەها بەندەكانی خوای میهرەبان) ئەوانەن كە: كاتێك ماڵو سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەكەن، نە زیادەڕەوی تێدا دەكەن و بازایەی دەدەن، نە دەست نوقاو ڕەزیلیشن، بەڵكو لەو نێوانەدان (مام ناوەندین و لە شتی بەسوود بەكاری دەهێنن). * هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەكی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، كەسیش ناكوژن كە خوا كوشتنی حەرام كردبێت مەگەر بە حەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناكەن و نزیكی ناكەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە كارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە توشی سزا و ئازارو ڕیسوایی دەبێت.}

## شێوازی بیست و شەش( ٢٦ )ـ :

### لە قورئانی پیرۆزدا پاڕانەوە لە خودا

### نیشانەی عەقل و ژیری و تێگەیشتن و پێگەیشتنی دوعاكارە

### ( الدعاء من الله من دلائل رُشد الداعي و حنكته )

(١) ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾﴾[١٩٦] .

لە ئایەتەكەدا تەمەنی ژیری كە چل ساڵە بە خسلەتی ژیری دەبەستێت، كە دوعاكردنە.

---

(١٩٦) الأحقاف: ١٥. { ئێمە فەرمانمان بەئادەمیزاد داوەكە چاكەكارو چاك ڕەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوكیدا، دایكی بەئازارەوە هەڵی گرتووەو بەدەم ئێش و ئازارەوەبوویەتی، سک پربوون و لەشیر برینەوەی سی دانە مانگی خایاندوون .. هەتا كاتێک ئینسان دەگاتە حاڵەتی توندوتۆڵی و توانایی و تەمەنی چڵ ساڵی ( ئەوسا ئیتر حەق وایە ئەم دۆعایە بكاتەیەكێک لەوێردەكانی سەر زاری و ) بڵێت : پەروەردگار !! كۆمەكیم بكەو یارمەتیم بدەتا شوكرانەبژێر و سوپاسگوزاری ئەو نازو نیعمەتانە بم كەبەمن و دایک و باوكمت بەخشیوە، هەروەها یارمەتیم بدەلەو جۆرە كاروكردەوەچاكانەئەنجام بدەم،كەتۆ پێی ڕازیت، داواكاریشم چاكەبڕوێنیت لەناو نەوەكانمدا لەبەر قازانجی خۆم ( چاكەی هەركەس بەشی دایک و باوكی تیادایە ) بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ، تا لەگوناهەكانم خۆش ببیت و من لەموسڵمانانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارم }.





(٢) ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾
ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ
فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ
ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾
رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾(١٩٧)

---

(١٩٧) آل عمران:١٩٠ - ١٩٤ { بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە ئاڵو گۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند...* ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەک، سەرنجی هەموو دیاردەیەک دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ* پەروەردگارا بەڕاستی تۆ هەرکەس بخەیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە ئیتر شەرمەزارو ڕیسواو خەجاڵەتت کردووە، (جا بێگومان لەوێ) ستەمکاران هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە* پەروەردگارا؛ بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێک بوو، بانگی کردین بۆ ئیمان و (دەیفەرموو): ئیمان بهێنن بە پەروەردگارتان جا ئێمەش (بێ دوودڵی)، خێرا باوەڕمان هێناو (وتمان): پەروەدگارا؛ دەتۆش لەگوناهو هەڵەکانمان خۆش ببە، چاوپۆشی بکە لەکردارە ناپەسەندەکانمان و (لەسەر ڕێبازی) چاکان و (بەختەوەران) بمانمرێنە و

لە ئایەتەکاندا باسی سیفەتەکانی مرۆڤی ژیر دەکرێت، لەو سیفەتانە پاڕانەوە تەنها لە خودای پەروەردگار.

(٣) ﴿إِذۡ أَوَى ٱلۡفِتۡيَةُ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا ﴿١٠﴾﴾(١٩٨) .

(٤) ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾(١٩٩)

لەم دوو ئایەتەدا پەروەردگار ڕێنمایماندەکات بۆ وەدەستهێنانی ژیریی بە پاڕانەوە، کەواتە پارانەوە لە پەروەردگار ژیرییە.

---

لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە * پەروەردگارا؛ ئەو بەڵێنانەشمان بۆ ئەنجام بدە کە لەسەر زاری پێغەمبەرانتدا بەئێمەت داوە (کە سەرکەوتنە لە دنیاداو بەهەشتی بەرینە لە داهاتوودا) و لە ڕۆژی قیامەتیشدا خەجاڵەت و ڕوو زەردمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن شکێن نیت و بەڵێنی خۆت دەبەیتە سەر}.

(١٩٨) کهف:١٠ { کاتێك لاوەکان پەنایان بردە بەر ئەشکەوتەکەو نزایان کرد، جا وتیان: پەروەردگارا لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەت و میهرەبانی تایبەتیمان پێ ببەخشە و لە سۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکەو ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا }.

(١٩٩) البقرة: ١٨٦ { (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بە هاناو هاواری دۆعا گۆیانەوە دەچم هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری و ئاگایی بگرنەبەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان)}.

## شێوازی بیست و حەفت( ٢٧ )ـ:

### ڕێزبەندی ئایەتەکانی قورئان ڕێنمایین بۆ پاڕانەوە تەنها لە خودا و پایەداری دوعاکار

### ( سیاقات آي القرآن في شرف الداعين من الله دون غيره و منزلتهم ـ آية السجدة نموذجاً ـ )

| پێش<br>ئایەتی باسی دوعاکردن | ئایەتی باسی دوعاکردن | پاش<br>ئایەتی باسی دوعاکردن |
|---|---|---|
| ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾﴾ | ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾﴾ | ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾﴾ |
| ستایشکردنی ئیمانداران ئەوانەی کاتی بیستنی قورئان سوجدە دەبەن سۆپاسگوزاری و ملکەچی بۆ خودا دەنوێنن. | ئەمانە شەوان بە شەونوێژ دەبەنەسەر و پاڕانەوە لە پەروەردگار هەڵدەبژێن دوور لە جێگای خۆش و نووستنی بەلەزەت لە ترسی ئاگری دۆزەخ و بە هیوا و تەماعی بە بەهەشت خێرو سەدەقە دەکەن... | ئەمانە نازانن و ناتوانن تەصەور بکەن کە خودا چ بەهەشتێکیان بۆ ئامادەکردووە |

هاتنی باسی دوعاکردن پاش مەدحی دوعاکار پێش پاداشتەکەی، ئاگادارکردنەوەی موسڵمانە لە گەورەیی پاڕانەوە تەنها لەخودا.

ئاماژەی ڕێزبەندی ئایەتەکان بۆ گەورەیی دوعا و پاڕانەوە زۆر دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا پەیامێکە بۆ ئیماندار کە دوعا و پاڕانەوە تاجی هەموو چاکەکارییەکن. بڕوانە شێوازی (١٠)(٤٦)(٤٧).

## شێوازی بیست و هەشت( ٢٨ )ـ:

### تورەبوون بە باسکردنی تەنها پاڕانەوە لەخودا سیفەتی کافرەکانە

### ( من صفات الكفار بغضهم توحيد الله بالدعاء )

(١) ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ
ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن
يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾﴾ (٢٠٠)
(٢) ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا
ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ
إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾....﴾ (٢٠١) .

---

(٢٠٠) الغافر:١٢ - ١٤{ئێستاش ئەو بارودۆخەی کە تێی کەوتوون بەهۆی ئەوەوەیە، بەڕاستی کاتێک بانگەواز بکرێت بۆ پەرستنی خوای تاک و تەنها، ئێوە باوەڕ ناهێنن، خۆ ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت و ڕێبازی یەکخواناسین کەناربخرێت، ئێوە باوەڕ بەوە دەهێنن، ئێستاش فەرمان، هەر فارمانی خوای بەرزو بڵند و گەورەیە (بۆ جیاکردنەوەی ئیمانداران لە بێ باوەڕان). * ئەو خوایە بەردەوام بەڵگە و نیشانەی دەستەڵاتداری خۆیتان نیشان دەدات، لە ئاسمانیشەوە ڕزق و ڕۆزیتان بۆ دادەبەزێنێت (وەک: باران، هەوا، جۆرەها تیشک، کە دەبنە سەرچاوەی ڕۆزی) کەسیش یاداوەری وەرناگرێت و بیرناکاتەوە جگە لەوانەی کە: دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو زاتە. *کەواتە ئەی ئیمانداران: ئێوە هەر هانا و هاوار بۆ خوا بەرن و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو بن، ئەگەر چی کافرو بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت}.





ئایەتەکان باس لە ناخی مرۆڤی کافر و موشریك دەکەن، ئەم مرۆڤە کاتێك باسی پاڕانەوە تەنها لە خودا بۆی کرا، تووشی نارِەحەتی و بێزاری دەبێت، چونکە لەناخیدا شیرك هەیە، وا تێگەیشتووە کە کەسانێك بە هانایەوە دێن و شەفاعەتی بۆ دەکەن، وەك شێخ و مەلاو و قەبر و دار و بەرد...

---

(٢٠١) الزمر: ٤٤ - ٤٥ {ئینجا پێیان بڵێ: تکاکارو تکاوەرگرتن و تکاکردن، هەر هەمووی بەدەست خوایە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هەر ئەو خاوەنیانە، لەوەودوایش هەر بۆلای ئەو دەبرێنەوە * کاتێکیش تەنها ناوی خوا برا، ئەوانەی کە باوەڕیان بەقیامەت و ڕۆژی دوایی نیە دڵیان دەگیرێت و بێزاری دایان دەگرێت، (بەڵام) کاتێکیش باسی شتی تر بکرێت جگە لە خوا، دەستبەجێ دڵخۆش و کەیف خۆش دەبن و حەزی پێدەکەن}

## شێوازی بیست و نۆ ـ( ٢٩ )ـ:

### لە قورئانی پیرۆزدا دوعاکردن لە بێجگە لە خودا،

### بە عیبادەتکردنی بێجگە لە خودا ناو دەبرێت و دەناسرێت.

**( يأتي الدعاء في القرآن بمعنى العبادة )**

**( الدعاء من غير الله = العبادة لغير الله )**

(١) ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ
جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾(٢٠٢)

(٢) ﴿وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا
٤٨ فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا
نَبِيّٗا﴾(٢٠٣)

---

(٢٠٢) غافر : ٦٠. {ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن؛ ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.}.

(٢٠٣) مریم : ٤٨ - ٤٩. {وا من دوور دەکەومەوە و کەنارگیری دەکەم، لە ئێوە و لەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، من تەنها هاناو هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم و هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم کە پەروەردگارم نائومێد و ڕەنجەڕۆم نەکات و دوعاو نزاو پەرستنم لێ وەربگرێت. * جا کاتێک ئیبراهیم ڕۆیشت و دوور کەوتەوە لەو خەڵکە گومڕایە و لەو شتانەی کە لە جیاتی خوا دەیانپەرست، ئێمە ئیسحاقمان پێبەخشی و بە ئیسحاقیش، یەعقوبمان بەخشی، هەریەک لەوانیشمان کردە پێغەمبەر.}

(٣) ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ
وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَـٰفِلُونَ ۝ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ
كَـٰفِرِينَ﴾ (٢٠٤)

(٤) ﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝١٢٣ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ۝١٢٤ أَتَدْعُونَ بَعْلًا
وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَـٰلِقِينَ ۝١٢٥﴾ (٢٠٥)

(٥) ﴿قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ ۙ قَدْ
ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ۝٥٦﴾ (٢٠٦)

---

(٢٠٤) الأحقاف: ٥ - ٦ {جا ئیتر کێ لەو کەسە گومڕاترە کە دوعاو نزا و پاڕانەوە، ڕوو بەکەسێک یان شتێک دەکات، جگە لەخوا کە ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتیش لێی بپاڕێتەوە بێ سوودە، نەبەهانایەوە دەچێت، نەبەپەرستنەکەش دەزانێت، لەکاتێکدا ئەوانەلەدوعاو پارانەوەی ئەوان بێ ئاگاو غافڵن و هەستی پێ ناکەن . * کاتێکیش کەخەڵکی کۆدەکرێنەوە بۆ لێ پرسینەوە، بت و پەرستراوەکان دەبنە دوژمن بۆ ئەو کەسانەکە لەدونیادا دەیانپەرستن، بەهیچ شێوەیەک بڕوایان پێ ناکەن، بەڵکو بەدرۆیان دەخەنەوە.}

(٢٠٥) الصافات: ١٢٣ - ١٢٥ . { بێگومان - ئیلیاس - یش لە دەستەی پێغەمبەران و ڕەوانە کراوانە (لە لایەن ئێمەوە). * ئەوکاتە ئەویش بە قەوم و گەلەکەی خۆی وت: ئەوە ناکرێت خواناس بن؟ ئەوە بۆ لەخوا ناترسن؟! * ئایا ئێوە هاناو هاوارو نزا بۆ - بەعل - دەبەن (بتێکی گەورە بوو دەیانپەرست) وە واز لە خواپەرستی دەهێنن لەکاتێکدا ئەو زاتە چاکترینی دروستکارەکانە }.

(٢٠٦) الأنعام : ٥٦ . { (بەبێ باوەڕان) بڵێ: بەڕاستی من قەدەغە کراوم لە پەرستنی ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن لە غەیری خوا (هەروەها) بڵێ: من شوێن ئارەزووەکانی ئێوە ناکەوم (ئەگەر





(٦) ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَمَّا جَاءَنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٦٦﴾﴾ (٢٠٧)

(٧) ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ﴿١٠﴾﴾ (٢٠٨) .

(٨) ﴿وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾﴾ (٢٠٩) .

(٩) ﴿وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ اللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ﴾ (٢١٠) .

---

وابکەم)، ئەوە ئیتر بێگومان ئەو کاتە من سەر لێشێواو دەبم و هەرگیز لە هیدایەت دراوان نیم}.

(٢٠٧) غافر: ٦٦ { ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: بێگومان من قەدەغەم لێکراوە ئەو شتانە بپەرستم کە ئێوە لە جیاتی خوا هانا و هاواری بۆ دەبەن، لە کاتێکدا بەڵگە و نیشانەی زۆر ئاشکرام لە لایەن پەروەردگارمەوە پێگەیشتووە و من فەرمانم پێ دراوە بە ملکەچی خۆم بدەمە دەست پەروەردگاری هەموو جیهانیان}.

(٢٠٨) القمر: ٩ ـ ١٠ { پێش ئەمانیش قەومی نوح بروایان بەبەندەی بەڕێزی ئێمە نەکردو وتیان: شێتە، زۆریش پیاهەڵشاخان و دژایەتی کرا * (ئەویش دوای (٩٠) ساڵ هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی: خوایە، بەڕاستی من شکستم خواردووەو سەرکەوتنم پێ ببەخشە}.

(٢٠٩) الجن: ١٨ . { دڵنیابن کە: مزگەوتەکان تایبەتی خوای گەورەن، دەبێت هەر ئەوەی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نەکرێتە شەریك و هاوتای ناوی ئەو زاتە.}

(٢١٠) الشعراء: ٩٢ - ٩٣ { پێشیان دەوترێ: لە کوێن ئەوانەی دەتانپەرست؟... * لە جیاتی خوا، ئایا یارمەتی ئێوەیان پێ دەدرێت یان فریای خۆیان دەکەون ؟}





ئایەتەکان ئاماژە بۆ ئەوەدەکەن کە (دوعا) و (عیبادەت) لە قورئانی پیرۆزدا بە هەمان مانا دێن، کەواتە هەموو دوعاکردنێك لە بێجگەلە خودا، عیبادەتە بۆ بێجگە لە خودا ئەمەش دەرچوونە لە ئیسلام.

## شێوازی سـ( ٣٠ )ـی:

### لە قورئانی پیرۆزدا دوعاکردن بە (دین) ناودەبرێت [٢١١]

### (الدعاء من الله = دين الإسلام)

### (الدعاء من غير الله = دين الكفر)

(١) ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾ [٢١٢].

(٢) ﴿فَإِذَا رَكِبُواْ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾ [٢١٣].

---

(٢١١) قال بعض أهل العلم : أن الدعاء من أفضل العبادات و أجل الطاعات و لهذا أخبر سبحانه و تعالى أنه الدِّينُ فذكر معرفاً بالألف و اللام. ينظر: النبذة الشريفة ضمن مجموعة الرسائل و المسائل النجدية(٤\٥٩٧) و تأسيس التقديس ص٧٨ و كتاب الدعاء و منزلته من العقيدة الإسلامية (١\٢٩٤ - ٢٩٥)

(٢١٢) لقمان: ٣٢. {کاتێکیش لە دەریادا شەپۆلێک ئابلۆقەی هاوەڵگەرو کارەکان بدات، وەک کێوەکان گەورە بێت، ئەوە هاناو هاوار هەر بۆ خوا دەبەن زۆر بە دڵسۆزانە ملکەچن بۆ خوا، جا کاتێک فریایان دەکەوێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانگەیەنێتە وشکانی، جا هەیانە بەردەوام دەبێت لە سەر ڕێبازی ئیمان و دەمێنێتەوە لەسەر یەکتاناسینی خوای میهرەبان، (هەشیانە ڕێگەی نادروستی خۆی دەگرێتەوە)، جا کەس لە ئایات و بەڵگەکانی ئێمە نکول و پەیمان شکێنی ناکت جگە لە زۆردار و ناپاک و سپڵە. }.

(٢١٣) العنكبوت: ٦٥. { هەر کاتێک خەڵکی (باوەڕ لاواز) سواری کەشتی دەبن، مەترسی نوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات، زۆر بەکوڵ، هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن و بە دڵسۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام کاتێک خوا ڕزگاریان

(٣) ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمۡ فِى ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ‌ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِى ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ‌ۙ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَـٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾ (٢١٤)

لەم سێ ئایەتەدا پەروەردگار باس لە مرۆڤ دەکات، کە لە کاتی تەنگانەدا هاناو هاوار تەنها بۆ خودا دەبات، داواکاری ڕزگاربوون تەنها لە خودا دەکات، پەروەردگار لەم باسکردنەی بۆ حاڵی مرۆڤ دوعاکردنی بە ئاین(دین) ناودەبات دەفەرمێت: ﴿دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ - أي مخلصين لله في الدعاء -

---

دەکات و دەگەنەوە وشکانی دەستبەجێ لە ڕێبازی یەکتاپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن.}.

(٢١٤) یونس:٢٢. { (ئەی هاوەڵگەڕان) خوا ئەو زاتەیە کە لەوشکانی و دەریادا هاتو چۆتان پێدەکات، هەتا ئەو کاتەی کە لەکەشتیەکاندا دەبن و دەیانگوێزنەوە بەهۆی باو شەماڵێکی پاک و ئارامەوەو هەمووان دڵخۆشن پێی، ئەوە بایەکی توندو بەهێز و سەخت بەرەو کەشتیەکە بێت و هەڵبکات،لەهەموو لایەکەوە شەپۆل بۆیان بێت، ئیتر وابزانن کە دەورەدراون و (ڕزگار بوونیان ئەستەمە، ئا لەو کاتەدا خەڵکەکە بەسۆزەوە) هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن، دڵنیان خوا نەبێت کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت، لەکاتێکدا بیرو باوەڕو ئاینیان بەتەواویی پاک و پوخت و یەکلایی دەکەنەوە بۆ خوا، بۆیە بەسۆزەوە دەڵێن: سوێند بەخوا ئەگەر لەم بەڵایە، لەم تەنگانەیە، ڕزگارمان بکەیت، ئەوە بەڕاستی دەچینە ڕیزی سوپاسگوزارانتەوە}.

.

(٤) ﴿فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ (٢١٥)

(٥) ﴿هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ (٢١٦)

(٦) ﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ﴾ (٢١٧)

---

(٢١٥) الغافر:١٤. {کەواتە ئەی ئیمانداران: ئێوە هەر هانا و هاوار بۆ خوا بەرن و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو بن، ئەگەر چی کافرو بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت.}.

(٢١٦) الغافر: ٦٥. {ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام هەر زیندووە، جگە لەو خوایەکی تر نیە، کەوابوو هانا و هاوار و نزاتان ڕوو بەو بێت، ملکەچ و فەرمانبەرداری بەرنامە و ئاینەکەی ئەو بن، سوپاس و ستایش بۆ خوا، کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە. }
.

(٢١٧) الأعراف:٢٩. {(ئەی محمد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لەکاتی هەرپەرستن و نوێژێکدا، لە هەموو مزگەوتێکدا، ڕووی دڵ و ڕوخسارتان بەڕاستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە، لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکە هەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە...}.





(٧) ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾﴾ (٢١٨)

(دوعا) و (دین) لەم ئایەتانەدا بە هەمان مانا هاتوون، کەواتە هەردەقێکی قورئانی پیرۆز هانی دینداری بدات هاندانە بۆ زۆر دوعاکردن و پاڕانەوە تەنها لە خودای پەروەردگار، هەروەها هەر دوعایەك لە بێجگە لە خودای پەروەردگار بکرێت دیندارییە بۆ بێجگە لە خودای پەروەردگار، ئەمەش دەرچوونە لە ئیسلام.

---

(٢١٨) غافر: ٢٦ - ٢٧ . {ئینجا فیرعەون وتی: وازم لێ بهێنن با موسا بکوژم، با هەر هاوار لە پەروەردگاری بکات، چونکە بەڕاستی من دەترسم کە دین و ئاینتان بگۆڕێت!، یاخود دووبەرەکی و خراپە و شەڕ و شۆڕ لە وڵات و سەرزەویدا بەرپا بکات!! * موساش وتی: بێگومان من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆم کە پەروەردگاری ئێوەشە لە هەموو لووت بەرزو خۆبەزل زانێک باوەڕی بەڕۆژی لێپرسینە نەبێت (ڕاستیەکان ئاوەژوو بکات)}.





## شێوازی سی و یەک( ٣١ )ـ:

### لە قورئانی پیرۆزدا دوعاکردن لە بێجگە لە خودا

### بە ( شیرك ) دەژمێردرێت و بە ( شیرك ) ناودەبرێت.

### ( يأتي الدعاء من غير الله في القرآن بمعنى الشرك بالله )

### ( دعاء من غير الله = الشرك بالله )

(١) ﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ﴾(٢١٩)

(٢) ﴿يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى
لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۚ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ
مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾﴾(٢٢٠)

---

(٢١٩) الأنعام: ٤٠ - ٤١ {(بە خوانەناسان) بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر سزاو تۆڵەی خوا یەختان پێبگرێت، یان قیامەت یەختان پێ بگرێت، (ئا لەو کاتانەدا) هاناو هاوار بۆ کەسێک دەبەن جگە لە خوا؟ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن کە غەیری خوا فریاتان دەکەوێت؟! * (نەخێر لەوکاتە سامناکانەدا) هەر هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە دەبەن (ئەویش خوایەکی میهرەبانە) بەڵاو ناخۆشیەکانتان لەسەر لادەبات ئەگەر بیەوێت، جا لەوکاتەدا هەر شتێک کە بە هاوەڵ شەریکی ئەو زاتەی دادەنێن، فەرامۆشی دەکەن.}.

(٢٢٠) فاطر : ١٣ - ١٤{(هەر خوایە کە): شەو تێهەڵکێشی ڕۆژ دەکات، ڕۆژیش تێهەڵکێشی شەو دەکات، خۆرو مانگی ڕامهێناوە، هەریەکەیان تاکاتێکی دیاری کراو

(٣) ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾ (٢٢١)

(٤) ﴿فَإِذَا رَكِبُواْ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾ (٢٢٢)

---

لە سووڕانەوەدایە، ئائەو خوایە پەروەردگارتانە خاوەنی هەموو موڵک و بەدیهاتووەکانە، (بەڵام) ئەوانەی جگە لەو هاناو هاواری بۆ دەبەن ولێی دەپاڕێنەوە تەنانەت خاوەنی توێکڵە تەنکەکەی دەوری ناوکی خورمانیش نین. * خۆ ئەگەر هاناو هاواریان بۆ بەرن گوێیان لێتان نییە و نابیستن، ئەگەر بشبیستن بە دەمتانەوە نایە، ڕۆژی قیامەتیش حاشا دەکەن لێتان و لەوەی کە بە (خواتان) زانیوون، بێگومان کەس نییە وەک (خوا) ئاگاو زانا بێت و هەواڵی ڕاست و دروست بگەیەنێت.}.

(٢٢١) الروم: ٣٣.{ کاتێك تەنگانەو ناخۆشی تووشی خەڵکی دەبێت، هاناو هاوار بۆ پەروەردگاریان دەبەن و هەر لەو دەپاڕێنەوە، پاشان کە ناخۆشی و تەنگانەکە نەماو خوا دەوری ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی لێکردنەوە، یەکسەر دەستەیەکیان هاوەڵ بۆ پەروەردگاریان بڕیار دەدەن.}.

(٢٢٢) العنکبوت: ٦٥. {هەر کاتێک خەڵکی (باوەڕ لاواز) سواری کەشتی دەبن، مەترسی نوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات، زۆر بەکوڵ، هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن و بە دڵسۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام کاتێک خوا ڕزگاریان دەکات و دەگەنەوە وشکانی دەستبەجێ لە ڕێبازی یەکتاپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن.}





(٥) ﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾(٢٢٣)

(٦) ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾﴾(٢٢٤)

(٧) ﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾﴾(٢٢٥)

---

(٢٢٣) غافر: ٧٣ - ٧٤ . { لەوەودوا پێیان دەوترێت: کوان ئەو شتانەی کە بە هاوەڵتان دادەنا بۆ خوای باڵادەست؟!... * لە جیاتی خوا دەتانپەرست، بەکەساسی و خەجاڵەتیەوە دەڵێن: لێمان ون بوون، دیار نین!!، بەڵکو ئێمە هەر ناوی کەسی ترمان نەدەبرد (دیارە لە ترسدا، یان هەر بیروباوەڕی خۆیان فەرامۆش کردووە)، ئا بەو شێوەیە خوا کافران سەرگەردان و سەرلێشێواو دەکات...}.

(٢٢٤) غافر: ١٢ { ئێستاش ئەو بارودۆخەی کە تێی کەوتوون بەهۆی ئەوەوەیە، بەڕاستی کاتێک بانگەواز بکرێت بۆ پەرستنی خوای تاک و تەنها، ئێوە باوەڕ ناهێنن، خۆ ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت و ڕێبازی یەکخواناسین کەناربخرێت، ئێوە باوەڕ بەوە دەهێنن، ئێستاش فەرمان، هەر فارمانی خوای بەرزو بڵند و گەورەیە (بۆ جیاکردنەوەی ئیمانداران لە بێ باوەڕان)}.

(٢٢٥) یونس: ٦٦ { ئاگادار بن کە بەڕاستی هەر کەس لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە خوا خاوەنیانە، ئەوانەی جگە لە خوا شتی تر دەپەرستن و پەیڕەوی ڕێبازی تر دەکەن (وەنەبێت شوێن ڕێبازێکی چاک کەوت بن) ئەوانە تەنها شوێنی گومان کەوتوون، ئەوانە جگە لە درۆ کردن و گۆترەکاری هیچی تر ناکەن.}

(٨) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ
فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثٗا وَإِن يَدۡعُونَ إِلَّا شَيۡطَٰنٗا
مَّرِيدٗا ﴿١١٧﴾﴾ (٢٢٦)

(٩) ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا ﴿٢٠﴾﴾ (٢٢٧)

(١٠) ﴿وَأَنۡ أَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدۡعُ مِن
دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَۖ فَإِن فَعَلۡتَ فَإِنَّكَ إِذٗا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾﴾ (٢٢٨)

---

(٢٢٦) النساء: ١١٦ - ١١٧ { بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو (هاوبەش دانانە) لە گوناهانی تر بۆ هەر کەس بیەوێت و شایستە بێت و (پەشیمان بێت) خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریک و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕاییەکی زۆر دوور. * (ئەو هاوەڵگەرانە) ئەوەی هاناو هاواری بۆ دەبەن و دەیپەرستن - جگە لەخوا - چەند پەرستراوێکی کار تێکراون (پەرستراو دەبێت کارتێکەر بێت نەک کارتێکراو، بۆیە بتەکانیان بەمێینە ناوناوە وەک: لات و عوززا)، تەنها هاناو هاواریشیان هەر بۆ شەیتانی سەرکەش و یاخی یە کە لە هەموو خێرێک داماڵراوە.}

(٢٢٧) الجن: ٢٠ {پێیان بڵێ: من هەر بەردەوام دەبم و هەر بانگەواز دەکەم بۆ لای پەروەردگارم، کەسیش ناکەمە هاوەڵ و شەریکی}

(٢٢٨) يونس: ١٠٥ - ١٠٦.{هەروەها فەرمانم پێدراوە کە بەڕاست و ڕەوان ڕووت بکەرە ئاین و دینداری بەوپەڕی ملکەچی و دڵسۆزیەوە، هەروەها فەرمانم پێدراوە کە: نەکەیت لە دەستەی موشریک و هاوەڵگەڕان بیت. * هاناو هاواریش نەبەیت بۆ کەسێک یان شتێک لە جیاتی خوا، کە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت نە زیان

(١١) ﴿قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ
هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ
﴿٦٤﴾﴾ (٢٢٩).

(١٢) ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ
ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾﴾ (٢٣٠).

---

(چونكە قازانج و زیان هەر بەدەست خوایە)، خۆ ئەگەر كاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ستەمكارانیت.}

(٢٢٩) ألأنعام: ٦٣ - ٦٤ { ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: كێ فریاتان دەكەوێت و ڕزگارتان دەكات لە تاریكیەكانی وشكانی و دەریادا، (كاتێک گیردەخۆن) و بە كەساسی لێی دەپاڕێنەوە، بەنهێنی هانای بۆ دەبەن، (پەیمان دەدەن و دەڵێن) سوێند بێت بە خوا ئەگەر لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بكەیت، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەچینە ڕیزی سوپاسگوزارانەوە.* جا لە وەڵامیاندا بڵێ: خوا لەو تاریكیانە و لە هەموو كۆسپێک ڕزگارتان دەكات، كەچی پاشان (زۆربەتان) هاوەڵ و شەریكی بۆ بڕیار دەدەن}

(٢٣٠) النحل: ٥٣ - ٥٤ { هەرچی نازو نیعمەتێكتان هەیە هەمووی بەهرەو بەخششی خوایە، پاشان كاتێك ناخۆشی و بەڵایەكتان بۆ پێشهات، ئەوە هاناو هاوارو پەنا هەر بۆ لای ئەو دەبەن و هەر لەو زاتە دەپاڕێنەوە * لەوەودوا كاتێك بەڵاو ناخۆشی لەسەر لابردن، دەستبەجێ دەستەیەك لە ئێوە هاوەڵ و شەریك بۆ پەروەردگاریان بڕیار دەدەن! }





(١٣) ﴿۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًاۖ إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ ٨﴾ [(٢٣١)].

لەم هەموو ئایەتانەی باسكران بە ڕوونی دیارە كە دوعا لە بێجگە لە خودا لەقورئانی پیرۆزدا بەشیرك ناودەبرێت و مانای شیرك دەگەیەنێت، كە تاكە تاوانە لێخۆشبوونی نییە ئەگەر تۆبەی لێنەكرێت، زۆر دووبارەبوونەوەی ئەم هاوتاییە لەمانا و ناوناندا لە نێوان شیرك و پاڕانەوە لە بێجگەلە خودا پەیامێكە بۆ هەموو مرۆڤێك، تاوەكو خۆی لەم تاوانە بەدوور بگرێت و بەجوانی ماناكانی یەكخوداپەرستی تێبگات.

---

(٢٣١) الزمر: ٨ { ئادەمیزاد كاتێك ناخۆشی و زەرەرێكی تووشهات، هاناو هاوار بۆ پەروەردگاری دەبات و بەدڵشكاوی لێی دەلاڵێتەوە، پاشان كاتێك خوا دەرووی لێ كردەوە و ناز و نیعمەتی پێبەخشی، دوعا و نزا و هانا و هاوارەكانی ئەوسای فەرامۆش دەكات، چەندەها هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار دەدات، دەیەوێت خەڵكی لە ڕێبازی خوا وێڵ بكات، ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەو جۆرە كەسە بڵێ: كەمێك بە خوانەناسی ڕابوێرە، بەڵام دڵنیابە كە تۆ نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخیت}.

## شێوازی سی و دوو( ٣٢ )ـ:

### لە قورئانی پیرۆزدا دوعاکرن لە بێجگە لە خودا بە (کوفر) ناو دەبرێت

### (يأتي تسمية الدعاء من غير الله في القرآن الكريم بالكفر)

### (دعاء غير الله = الكفر بالله)

(١) ﴿لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ﴾ (٢٣٢) .

(٢) ﴿۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًاۖ إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾ (٢٣٣) .

---

(٢٣٢) الرعد : ١٤. {هەر بۆ خوایە بانگەوازی حەق و ڕاستی، (بەڵام) ئەوانەی هاناو هاوار بۆ کەسێکی تر دەبەن جگە لەو زاتە، هاوار لێکراوان بە هیچ شێوەیەك بەهانایانەوە نایەن و وەڵامیان نادەنەوە، مەگەر وەکو کەسێك (تینووی بێت لە دوورەوە) دەستەکانی درێژە بکات بۆ ئاو تا بیگەیەنێتە دەمی، کەچی بێسوودەو ناگاتە دەمی، بێگومان دوعا نزای بێ باوەڕان تەنها لەناو تاریکی و گومڕاییدایە و هیچی تر نی یە} .

(٢٣٣) الزمر : ٨. { ئادەمیزاد کاتێك ناخۆشی و زەرەرێکی تووشهات، هاناو هاوار بۆ پەروەردگاری دەبات و بەدڵشکاوی لێی دەلاڵێتەوە، پاشان کاتێك خوا دەرووی لێ کردەوە و ناز و نیعمەتی پێبەخشی، دوعا و نزا و هانا و هاوارەکانی ئەوسای فەرامۆش دەکات، چەندەها هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار دەدات، دەیەوێت خەڵکی





(٣) ﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ۝ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ (٢٣٤).

(٦) ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ ۝﴾ (٢٣٥).

لەم ئایەتانەدا بە ڕوونی دیارە کە دوعا لە بێجگە لە خودا لەقورئانی پیرۆزدا بە کوفر ناودەبرێت مانای کوفری گەورە دەگەیەنێت، کە تاکە تاوانە لێخۆشبوونی نییە ئەگەر تۆبەی لێنەکرێت، ئەم هاوتاییەش لەمانا و ناوناندا لە نێوان (کوفر) و (پاڕانەوە لە بێجگەلە خودا) پەیامێکە بۆ هەموو مرۆڤێك تاوەکو خۆی لەم تاوانە بەدوور بگرێت، بەجوانی ماناکانی یەکخوداپەرستی تێبگات.

---

لە ڕێبازی خوا وێڵ بکات، ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەو جۆرە کەسە بڵێ: کەمێك بە خوانەناسی ڕابوێرە، بەڵام دڵنیابە کە تۆ نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخیت.}.

(٢٣٤) غافر: ٧٣ - ٧٤ . { لەوەودوا پێیان دەوترێت: کوان ئەو شتانەی کە بە هاوەڵتان دادەنا بۆ خوای باڵادەست؟!... * لە جیاتی خوا دەتانپەرست، بەکەساسی و خەجاڵەتیەوە دەڵێن: لێمان ون بوون، دیار نین!!، بەڵکو ئێمە هەر ناوی کەسی ترمان نەدەبرد (دیارە لە ترسدا، یان هەر بیروباوەڕی خۆیان فەرامۆش کردووە)، ئا بەو شێوەیە خوا کافران سەرگەردان و سەرلێشێواو دەکات...}.

(٢٣٥) غافر:١٢. {ئێستاش ئەو بارودۆخەی کە تێی کەوتوون بەهۆی ئەوەوەیە، بەڕاستی کاتێک بانگەواز بکرێت بۆ پەرستنی خوای تاک و تەنها، ئێوە باوەڕ ناهێنن، خۆ ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت و ڕێبازی یەکخواناسین کەناربخرێت، ئێوە باوەڕ بەوە دەهێنن، ئێستاش فەرمان، هەر فارمانی خوای بەرزو بڵند و گەورەیە (بۆ جیاکردنەوەی ئیمانداران لە بێ باوەڕان)}.

## شێوازی سی و سێ (٣٣)یەم:

### لە قورئانی پیرۆزدا پشت کردن لە پاڕانەوە لە خودا، بە (کوفر = فیتنە=شیرك) دادەنرێت

### (الإعراض عن الدعاء من الله = فتنة الشرك و الكفر)

(١) ﴿۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًاۖ إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾ (٢٣٦)

(٢) ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلۡنَٰهُ نِعۡمَةٗ مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمِۭۚ بَلۡ هِيَ فِتۡنَةٞ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ (٢٣٧)

---

(٢٣٦) الزمر : ٨. { ئادەمیزاد کاتێك ناخۆشی و زەرەرێکی تووشهات، هاناو هاوار بۆ پەروەردگاری دەبات و بەدڵشکاوی لێی دەلاڵێتەوە، پاشان کاتێك خوا دەرووی لێ کردەوە و ناز و نیعمەتی پێبەخشی، دوعا و نزا و هانا و هاوارەکانی ئەوسای فەرامۆش دەکات، چەندەها هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار دەدات، دەیەوێت خەڵکی لە ڕێبازی خوا وێڵ بکات، ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەو جۆرە کەسە بڵێ: کەمێك بە خوانەناسی ڕابوێرە، بەڵام دڵنیابە کە تۆ نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخیت.}.

(٢٣٧) الزمر : ٤٩. { جا کاتێک ناخۆشی و ئازارێک تووشی ئینسان بێت، هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنێت و ئەگەر نازو نیعمەتێکمان پێبەخشی؛ دەڵێت؛ ئەمە تەنها شارەزایی خۆمە، زیرەکی خۆمە، لێهاتوویی خۆمە، نەخێر وا نیە؛ ئەو بەخشینە بۆ تاقی کردنەوەیە، بەڵام زۆربەیان بەم ڕاستیە نازانن.}.

فائدة (١): وشەی(الفتنة) لە زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا بەمانای شیرك و کوفر دێت لەوانە:





(٣) ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْۚ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ١٢﴾ (٢٣٨)

---

* ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾ ( البقرة :١٩٣)(الأنفال : ٣٩) .

* ﴿كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ﴾ (النساء: ٩١).

* ﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ﴾ (البقرة : ١٩١).

* ﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ﴾ (البقرة :٢١٧).

* ﴿وَلَوۡ دُخِلَتۡ عَلَيۡهِم مِّنۡ أَقۡطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُواْ ٱلۡفِتۡنَةَ لَأٓتَوۡهَا وَمَا تَلَبَّثُواْ بِهَآ إِلَّا يَسِيرٗا﴾ (الأحزاب:١٤).

و للمزيد ينظر: زاد المعاد لإبن القيم (٣\١٩٨ ـ ١٩٩ ط. عالم الفوائد) و مبحث مهم حول معاني الفتنة في القرآن الكريم. و كلمة (الفتنة) في القرآن الكريم أكثر من عشرة معاني ذكرها ابن الجوزي في كتابه المدهش (ص٣٠ ط. مروان القباني)

فائدة (٢): وشەی(شیرك) و (كفر) لە ڕاسترین ڕای زانایان هەمان مانا دەگەیەنن، بونمونە بتپەرست بتەکەی کردوتە شەریك بۆ خودا ئەمەش لەم ڕوویەوە شیرکە لە ڕووی ئینکارکردنی گەیشتنی دوعا بە خودا بە پێی واسیتە کوفرە، چونکە ئینکارکردنی گەورەترین نیعمەتی دونیایە کە موناجات و پاڕانەوەیە لە خودا، هەروەها کەسێ کە ئینکاری دەقێکی شەرعی ـ وەك بڕینی دەستی دز ـ بکات کوفرە ، لەهەمانکاتیشدا شیرکە چونکە کەسەکە عەقلی خۆی کردوتە شەریك بۆ خودا.

ینظر: التكفير و ضوابطه تأليف الشيخ إبراهيم الرحيلي ص٨١ ـ ٨٤ ط.دار الإمام أحمد.و السلسلة الضعيفة لشيخ ناصر (١٣ \ ٢١٠ ـ ٢١٢) .

(٢٣٨) غافر: ١٢ .{ئێستاش ئەو بارودۆخەی کە تێی کەوتوون بەهۆی ئەوەوەیە، بەڕاستی کاتێک بانگەواز بکرێت بۆ پەرستنی خوای تاک و تەنها، ئێوە باوەڕ ناهێنن، خۆ ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت و ڕێبازی یەکخواناسین کەناربخرێت، ئێوە باوەڕ بەوە دەهێنن، ئێستاش فەرمان، هەر فارمانی خوای بەرزو بڵند و گەورەیە (بۆ جیاکردنەوەی ئیماندارن لە بێ باوەڕان)}.

لە ئایەتەکانی ئەم شێوازە و هەروەها دوو شێوازی پێشتریش بە ڕاشکاوی دیارە کە (پشت کردن لە پاڕانەوە لەخودا) لە قورئانی پیرۆزدا بریتی بێت لە (کوفر، شیرك ، فتنە)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەر دەقێکی قورئانی پیرۆز نەهی لە (کوفر، شیرك ، فتنە) بکات لە مەبەستەکانی نەهی کردنە لە پاڕانەوە لە بێجگە لە خودا.

هەروەها بە تێڕامان لە ئایەتەکانی ئەم سێ شێوازە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤایەتی دابەش دەبێت بەسەر چوار بەشدا:

یەکەمیان: ئەوانەی تەنها لە خودا دەپاڕێنەوە.

دووەمیان: ئەوانەی لە خودا و لە بێجگەلەخودا دەپاڕێنەوە.

سێیەمیان: ئەوانەی تەنها لە بێجگەلەخودا دەپاڕێنەوە.

چوارەمیان: ئەوانەی لەکەس ناپاڕێنەوە نە لە خودا وە نە لە بێجگە لە خودا.

تەنها بەشی یەکەم رزگاربووە لە شیرك و کوفر سێ بەشی دیکە لە ئیسلام بەدەرن، کافر و موشریك و قوربەسەرن (٢٣٩) .

---

(٢٣٩) ئەهلی سوننە جیاوازی دەکەن لە نێوان کاری شیرك و مرۆڤی موشریك ودەڵێن (ليس كل من وقع في الشرك و الكفر وقع الشرك و الكفر عليه) واتە : مەرج نیە ئەوکەسەی کارێکی شیرکی ئەنجام بدا ت ببێتە موشریك و لە ئیسلام دەرچێت، چونکە واهەیە جاهیل بێت یان تەئویلێکی لا دروست ببێت بۆیە کەسێك کە ئیماندارە بە ئەرکانی ئیسلام دەرچوونی لە ئیسلام کارێکی ئاسن نییە، لەم بارەیەوە کاتێك شيخ الإسلام ابن تيميه (رحمه الله) گفتوگو لەگەڵ سەرانی فیرقەی جەهمی دەکات ـ کە کوفر و شیرکی ئاشکرایان لایە ـ پێیان دەفەرمێت ئەگەر من وەکو ئێوە بڵێم کافر دەبم بەڵام بە کافر ناتانزانم ! (ينظر: بيان تلبيس الجهمية





## شێوازی سی و چـ( ٣٤ )ـوار:

### فەرمانکردنی قورئانی پیرۆز بە دڵسۆزی ( ئیخلاص ) لە دوعاکردندا

### ( الأمر بالإخلاص في الدعاء )

(١) ﴿فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ (٢٤٠) .

(٢) ﴿هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾(٢٤١) .

(٣) ﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ﴾ (٢٤٢) .

دووبارەبوونەوەی فەرمانکردن بە ئیخلاص لە دوعاکردندا، ئاگادارکردنەوەیە لە گرنگی دوعاکردن و پاڕانەوە تەنها لە خودا.

---

١٠\١ و الرد على البكري ٢\٤٩٤ و مجموعة الفتاوى ٣\٢٢٩ ، ٣٥\١٦٤ ـ ١٦٥ و شرح الأصفهانية ص\٢١١ .

(٢٤٠) الغافر:١٤.{کەواتە ئەی ئیمانداران: ئێوە هەر هانا و هاوار بۆ خوا بەرن و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو بن، ئەگەر چی کافرو بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت}.

(٢٤١) الغافر: ٦٥. { ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام هەر زیندووە، جگە لەو خوایەکی تر نیە، کەوابوو هانا و هاوار و نزاتان ڕوو بەو بێت، ملکەچ و فەرمانبەرداری بەرنامە و ئاینەکەی ئەو بن، سوپاس و ستایش بۆ خوا، کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە}.

(٢٤٢) الأعراف:٢٩. { (ئەی محمد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لەکاتی هەرپەرستن و نوێژێکدا، لە هەموو مزگەوتێکدا، ڕووی دڵ و ڕوخسارتان بەڕاستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە، لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکە هەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە...}.

## شێوازی سی و پێنج( ٣٥ )ـ:

### باسکردنی قورئانی پیرۆز لە زمانی جەستەی پیاوچاکان لە کاتی دوعاکردن

**( لغة الجسد عند الدعاء من الله )**

(١) ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾[٢٤٣] .

(٢) ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ ۖ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾﴾[٢٤٤] .

---

(٢٤٣) البقرة: ١٤٤ . {(ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)) بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسورانی ڕووخسارت ڕوو بەئاسمان دەبینین (کە بە هیوای ڕووگەیەکی تایبەتیت، ئێمەش ئاگاداری نیازی دڵت بووین) سوێند بەخوا ئێمەش ڕووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەك پێی ڕازی و خۆشنوود بیت، دە ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (المسجد الحرام) و ئێوەش ئەی موسوڵمانان لە هەر کوێ بوون، بەرەو لای ئەوێ ڕووتان وەربچەرخێنن، بەڕاستی ئەوانەش کتێبیان پێ گەیشتووە (لە گاورو جوو) چاك دەزانن کە (ئەم گۆڕانی ڕووگەیە) حەقیقەت و ڕاستیە و فەرمانی پەروەردگاریانە (لە تەورات و ئینجیلدا ئاماژەی بۆ کراوە) و خوا هەرگیز بێ ئاگا نیە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.}

(٢٤٤) آل عمران : ٣٨ - ٣٩ { ئا لەو کات و شوێنەدا، زەکەریا هانا و نزای بۆ پەروەردگاری لێ بەرز بۆوە و وتی: پەروەردگارا نەوەی چاک و پاکم پێ ببەخشە، بەڕاستی تۆ بیسەری دوعا و نزایت * جا یەکسەر فریشتە جبرئیل بانگی کرد لەکاتێکدا زەکەریا لە میحرابەکەدا وەستا بوو، نوێژی دەکرد، (وتی) بەڕاستی خوای گەورە مژدەت دەداتێ بە بەخشینی کوڕێک ناوی یەحیایە، بەڕاستدانەری فەرمانی تایبەتی خوایە و گەورە و ڕێزدارە و خۆپارێزە لە گوناهان و پێغەمبەرێکە لە چاکان.)





(٣) ﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٩١﴾ (٢٤٥) .

(٤) ﴿فَإِذَا قَضَيۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمۡۚ فَإِذَا ٱطۡمَأۡنَنتُمۡ
فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ١٠٣﴾ (٢٤٦) .

(٥) ﴿وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ
ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٨٣﴾ (٢٤٧) .

---

(٢٤٥) آل عمران: ١٩١. { ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەک، سەرنجی هەموو دیاردەیەک دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ.}.

(٢٤٦) النساء: ١٠٣ {جا کاتێک لە نوێژ بوونەوە ئەوە یادی خوا بکەن بەپێوەبن یان بەدانیشتنەوە یان بە ڕاکشانەوە (بەهەرجۆرێک بۆتان گونجا) کاتێکیش ئارامی باڵی کێشا بەسەرتاناداو نیشتەجێ بوون، ئەوە نوێژ بەچاکی و تەواوی ئەنجام بدەن، چونکە بەڕاستی نوێژ لەسەر ئیمانداران فەرزە لەکاتی دیاریکراودا دەبێ ئەنجام بدرێت.}.

(٢٤٧) المائدة: ٨٣ {(ئەوانەیان کە بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕێن) هەر کاتێک گوێیان لە قورئان دەبوو کە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەزیووە، دەبینیت چاوەکانیان ئەسرینی خۆشی هەڵدەڕێژێت، بەهۆی ئەو حەق و ڕاستیەی کە دەیانناسی، لەکاتێکدا دەڵێن: پەروەردگارا ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە (بە ئاینی ئیسلام) دە تۆش لە ڕیزی (پەیڕەوان) و شایەتەکاندا تۆمارمان بکە.}





(٦) ﴿قُلۡ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ سُجَّدٗا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعٗا۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ﴿١١٠﴾﴾[٢٤٨].

باسکردنی زمانی جەستە لە دوعاکردندا ـ وەك لەم ئایەتانەی سەرەوەدا ـ خۆی لە خۆیدا پەیامێکە کە بێجگەلە دڵ و زۆبان دوعا بە زمانی جەستەش دەکرێت وەك فرمێسکی چاو و کڕنوشبردن ...هتد، لەهەموو کات و شوێن و حالەتێکدا.

---

(٢٤٨) الإسراء: ١٠٧ - ١١٠ .{ پێیان بڵێ: (ئەی خوانەناسان) باوەڕ بە قورئان بهێنن یان باوەڕی پێ نەهێنن (بەدەست خۆتانە و ئەمڕۆ سەربەستن، بەڵام بزانن) بەڕاستی ئەوانەی پێشتر زانیاریان پێدراوە، (دەربارەی تەورات و ئینجیلی دەستکاری نەکراو، چاك دەزانن کە ئەم قورئانە لە هەمان سەرچاوەوەیە، هەر بۆیە) کاتێك بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە (خۆیان پێناگیرێت) خێرا سەری ڕێزو نەوازشی بۆ دادەنەوێنن و سوژدە (بۆ نێرەری قورئان دەبەن) ❊ دەشڵێن: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارمانە، بەڕاستی بەڵێنی پەروەردگارمان هەر دێتە دی (بەسەر خستنی ئیمانداران لە دنیاداو سەرفرازیان لە قیامەتدا) ❊ ئەوانە سوژدە و کڕنووش دەبەن و دەگرین و ئەسرینی خۆشەویستی پەروەردگار لە چاوانیان دەبارێت، فرمێسکی ئیمان و شادی هەڵدەوەرێنن و تا دێت زیاتر ملکەچ و فەرمانبەردار دڵ پڕ لە ئیمان دەبن ❊ پێیان بڵێ: ئێوە لە نزاو دوعاتاندا هاوار لە (الله) بکەن، یان بەسیفەتی پیرۆزی (الرحمن) هانای بۆ بەرن، بەهەر ناوو سیفەتێکی جوان و بەرز هاواری لێبکەن و نزا بکەن دروستە، چونکە ئەو خاوەنی هەموو سیفات و ناوە پیرۆزو جوانەکانە، بەهەر سیفەتێك کە لەگەڵ داخوازیەکانتاندا گونجا، داوای لێ بکەن، لەکاتی داواکردنی ڕزق و ڕۆزیدا بە (یا رزاق، یا وهاب) لەکاتی داوای سەرکەوتندا بە (یا قوی یا متین یا عزیز یا ....هتد، ئەی ئیماندار) لەکاتی خوێندنی قورئان لە نوێژەکاندا دەنگ بەرز مەکەو زۆریش نزمی مەکە، لەو نێوانەدا حاڵەتێکی لەبارو مامناوەندی ئەنجام بدە.}





## شێوازی سی و شەشـ( ٣٦ )ـ:

### لە قورئانی پیرۆزدا دوعاکرن لە بێجگە لە خودا

### ناوەڕۆکەکەی شوبهاندنی مەخلوقە بە خالق

### ( دعاء غير الله = تشبيه المخلوق بالخالق )

(١) ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾(٢٤٩) .

پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئاگادارماندەکاتەوە، کە دوعاو داواکاری لە بێجگە لە خودا مانای ئەوە دەگەیەنێت کە داوالێکراومان بە خودا شوبهاندووە و کردووتە شەریك بۆ خودا، چونکە تەنها خودا وەڵامی دوعاکار دەداتەوە.

---

(٢٤٩) الزمر : ٨. { ئادەمیزاد کاتێك ناخۆشی و زەرەرێکی تووشهات، هاناو هاوار بۆ پەروەردگاری دەبات و بەدڵشکاوی لێی دەلاڵێتەوە، پاشان کاتێك خوا دەرووی لێ کردەوە و ناز و نیعمەتی پێبەخشی، دوعا و نزا و هانا و هاوارەکانی ئەوسای فەرامۆش دەکات، چەندەها هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار دەدات، دەیەوێت خەڵکی لە ڕێبازی خوا وێڵ بکات، ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەو جۆرە کەسە بڵێ: کەمێك بە خوانەناسی ڕابوێرە، بەڵام دڵنیابە کە تۆ نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخیت.}
بڕوانە: ژمارە(٤) ل (١٣١ ـ ١٦٧) گۆڤاری ئەیووبی بابەتێك سەبارەت بە سیفەتی دەولەمەندی خودای پەروەردگار.





## شێوازی سی و حەفت( ٣٧ )ـ:

### لە قورئانی پیرۆزدا پاڕانەوە لە هەر شتێك بێجگە لەخودا بریتییە لە بەخودا دانانی ئەو شتە!

( طلب الدعاء من أي شيءٍ غير الله هو تأليه ذلك الشيء )

(١) ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ (٢٥٠) .

(٢) ﴿وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾(٢٥١) .

---

(٢٥٠) النمل : ٦٢. { ئایا کێیە جگە لە زاتی پەروەردگار کە بێت بە هانا و هاواری لێقەوماو و بێ دەرەتان و بێ داڵدەوە، کاتێک نزا دەکات و لێی دەپارێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبات و دەتانکاتە نیشتەجێ و جێنشین لە زەویدا، ئایا ڕەوایە لەگەڵ ئەو زاتەدا خوای تر هەبێت؟! کەمێک یاداوەری وەربگرن و تێفکرن و بیربکەنەوە} .

(٢٥١) القصص : ٨٨ . { لەگەڵ خوادا هانا و هاوار لە خوایەکی تر مەکە، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، هەرچی شت هەیە تیاچووە لەناوچووە جگە لەو زاتە، فەرمانڕەوایی هەر شایستەی ئەوە، هەمووانیش هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە}.





(٣) ﴿وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡۖ فَمَآ أَغۡنَتۡ عَنۡهُمۡ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِي يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ لَّمَّا جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَمَا زَادُوهُمۡ غَيۡرَ تَتۡبِيبٖ ١٠١﴾ (٢٥٢)

(٤) ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ (٢٥٣)

(٥) ﴿وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ١٤ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ١٥﴾ (٢٥٤)

---

(٢٥٢) هود: ١٠١ . {ئێمە ستەممان لێنەکردن و بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، ئەوسا ئەو پەرستراوانەیان کە لەجیاتی خوا هاواریان لێ دەکردن، فریای هیچ شتێکیان نەکەوتن کاتێك فەرمانی پەروەردگاری تۆ هات، هیچیان بۆ زیاد نەکردن جگە لە تیاچوون نەبێت.}

(٢٥٣) فرقان: ٦٨ . { هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن...}

(٢٥٤) کهف: ١٤ - ١٥ { ئێمەش دڵەکانیانمان دامەزراو کردو ترسمان تێدا نەهێشت (بڕیاریاندا کۆمەڵگەی نەفامی بەجێبهێڵن) کاتێك هەستان و وتیان: پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە، هەرگیز هاناو هاوار بۆ هیچ خوایەکی تر نابەین جگە لەو، ئەگەر لەو ڕاستی یە لابدەین، سوێند بە خوا ئەوە بێگومان ئێمە لەو کاتەدا قسەی نابەجێ و نادروستمان کردووە * ئا ئەوانە قەومەکەی خۆمانن (لە ڕێبازی ڕاست لایانداوە لەجیاتی خواناسی) شتی تریان کردووە بە خوای خۆیان، دەبا




(٦) ﴿ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ
شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾﴾ (٢٥٥).

لەم ئایەتانەدا پەروەردگار دوعالێداواکراو(المدعو) بە خوداوەند (آلِهَة) ناودەبات، وەکو ئاگادارکردنەوەمان کە داوا لە هەر شتێك بکەین بێجگەلە خودا یان پەنا بۆ هەر شتێك ببەیەن بێجگە لە خودا، بریتییە لە بە خودادانانی ئەو شتە!

---

بەڵگەیەکی ئاشکراش بهێنن لەسەریان، جا کێ ستەمکارترە لەوەی کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێت؟!}.

(٢٥٤) (٢٥٥) یس: ٢٣ - ٢٤. { ئایا ڕەوایە لە جیاتی خوا چەند پەرستراوێکی تر بۆ خۆم بڕیار بدەم کە هیچیان بەدەست نیە خۆ ئەگەر خوای میهرەبان بیەوێت تووشی ناخۆشیەکەم بکات، تکاو پاڕانەوەی ئەو پەرستراوانە هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنن و فریام ناکەون و ڕزگارم ناکەن * بێگومان من ئەگەر شتی وا بکەم، ئەو کاتە من لە گومڕاییەکی ئاشکرا دەبم. }.





## شێوازی سی و هەشتـ( ٣٨ )ـ:

**لە قورئانی پیرۆزدا ئەگەر هەر شتێك بیکەیتە پەناگە و پاڵپشت بۆ خۆت بێجگە لە خودا، ـ وا تێبگەیت کە ڕزق و پاراستنت لە دەست ئەو شتەیە ـ ئەوا پشتت لە ئیسلام کردووە و تاوانی ( شیرك )ت ئەنجام داوە.**

**( إتخاذ الأولياء من دون الله و للواذ بهم و دعائهم = الشرك بالله )**

(١) ﴿قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ۗ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ (٢٥٦)

(٢) ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ (٢٥٧)

---

(٢٥٦) الأنعام : ١٤. { هەروەها پێیان بڵێ: ئایا (بەعەقڵ و ژیریی ئێوە ڕەوایە) کە جگە لە خوا کەسێکی تر بکەمە پشت و پەنای خۆم؟ کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە و هەر ئەویش ڕۆزی بەخشە و بێ نیازە لە هەموو ڕزق و ڕۆزیەک، دووبارە بڵێ: من بەڕاستی فەرمانم پێدراوە یەکەم کەس بم کە تەسلیمی ئەو زاتە ببم و موسوڵمان بم و (من پێت ڕادەگەیەنم) کە: هەرگیز نەکەیت لە موشریک و هاوەڵگەران بیت.}.

(٢٥٧) العنكبوت: ٤١-٤٢. {نموونەی ئەوانەی جگە لە خوای گەورە، کەسانێکی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان، وەك نموونەی جاڵجاڵۆکەیەك وایە کەماڵێکی بۆخۆی سازکردبێت بەڕاستی لاوازترینی هەموو ماڵەکان، ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر سەرنجیان بدایە و تێبگەیشتنایە ( چونکە ماڵی جاڵجاڵۆکە نە بناغە و نە دیواری هەیە، نە سەرو دەرگا و پەنجەرە، نە دەتوانێت بەرگەی با و باران و ڕوداوەکان بگرێت مێیەکەش نێرەکە لە ناو دەبات دوای جووت بوون، پاشان بێچوەکانیش دایکیان لە ناو دەبەن)

(٣) ﴿أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾﴾ (٢٥٨)

لەم ئایەتانەدا کردنی هەر شتێك بە پەناگە بێجگەلەخودای پەروەردگار، بە تاوانی شیرك ژمێردراوە.

---

بێگومان خوا خۆی چاکدەزانێت ئەوەی ئەو خەڵکە هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو، چەندە بێ دەسەلاتن، چونکە هەر خۆی خاوەن دەسەلاتە و زۆریش دانایە ( لەو بوارەی کە بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکی ڕەخساندویەتی ) . }.

(٢٥٨) النمل : ٦٣ - ٦٤ .{ ئایا کێ لە تاریکستانی سەر وشکانی و دەریا ڕێنموویتان دەکات تا ون نەبن؟! کێ بای شەماڵ (هەڵگری هەڵمی ئاو) دەنێرێت وەک مژدەیەک پێش گەیشتنی بارانی ڕەحمەت؟، ئایا ڕەوایە لەگەڵ خوادا خوای تر هەبێت، بەرزی و بڵندی و مەزنی بۆ خوای گەورە لەبەرامبەر ئەو شتانەوە کە نەفامان دەیکەنە هاوەڵ و شەریک بۆ ئەو زاتە * ئایا کێ لە سەرتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت، پاشان دوای تێکدانی سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە، کێ لەو ئاسمانەوە (بەهۆی تیشکی خۆر و باران و هەواوە) لە زەوییەوە (بە هۆی خاکەوە) ڕزق و ڕۆزیتان پێ دەبەخشێت؟، ئایا ڕەوایە لەگەڵ زاتی خوادا خوای تر هەبێت؟، پێیان بڵێ: ئادەی بەڵگەتان چییە بیهێننە مەیدان ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن}.

## شێوازی سی و نۆ ـ( ٣٩ )ـ:

### دوژمنانی پێغەمبەران دەیانزانی کە کاکلەی بانگەوازی پێغەمبەران ( علیهم السلام ) بانگەوازە بۆ تەنها پاڕانەوە لە خودا

### ( دراية أعداء الرسل بأن رسالة الرسل هو حث الناس على دعاء الله دون غيره )

(١) ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾﴾ (٢٥٩).

دژایەتی دوژمنانی پێغەمبەران (علیهم السلام) بۆ عیبادەتی (پاڕانەوە تەنها لە خودا)، ئەوە دەگەیەنێت کە کاکلە پەیامی پێغەمبەران(علیهم السلام) ڕێنماییکردنی خەڵکە بۆ تەنها پاڕانەوە لە خودا.

---

(٢٥٩) غافر: ٢٦ .{ ئینجا فیرعەون وتی: وازم لێ بهێنن با موسا بکوژم، با هەر هاوار لە پەروەردگاری بکات، چونکە بەڕاستی من دەترسم کە دین و ئاینتان بگۆڕێت!، یاخود دووبەرەکی و خراپە و شەڕ و شۆڕ لە وڵات و سەرزەویدا بەرپا بکات!}

## شێوازی چـ( ٤٠ )ـلّ:

### گەورەیی پاڕانەوە لە خودا و بەتاڵی پاڕانەوە لە بێجگە لەخودا

### ( عظمة الدعاء من الله و بطلان الدعاء من غيره )

(١) ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴿٦٢﴾﴾ [٢٦٠] .

لە ئایەتەکەوە بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازی نێوان پاڕانەوە لە خودای پەروەردگار و پاڕانەوە لە هەر شتێکی دیکە بێجگەلە خودای پەروەردگار، بریتییە لە جیاوازی نێوان حەق و باطل و ڕاستی و ناڕاستی.

---

(٢٦٠) الحج: ٦٢ .{ ئەو بیستن و بینینەش بە هۆی ئەوەیە چونکە بەڕاستی خوا خۆی حەق و ڕاستە، ئەوانەش کە ئەوان هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو هەر ئەوە خۆی باتاڵ و ناحەقیە. بێگومان ئەو خوایە بڵندو بەرزو مەزن و گەورەیە}.





## شێوازی چل و یەک( ٤١ )ـ:

### ئەوکەسەی لە بێجگەلە خودا دەپاڕێتەوە ستەم لە خۆی دەکات

### ( الداعي من غير الله ظالمٌ لنفسه )

(١) ﴿وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾﴾ (٢٦١) .

(٢) ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾﴾ (٢٦٢) .

ئەصلی ستەم دانانی کاری شیاوە لە جێگای ناشیاو، لە ئایەتی یەکەمدا دوعاکار لە بێجگەلەخودا بە ستەمکار ژمێراوە، چونکە دوعاکردن لە بێجگەلەخودا دانانی کاری شیاوە (پەرستن) لە جێگای ناشیاو (بۆ بێجگەلەخودا)، وەك نمونەی قەومی نوح (علیه السلام) ـ لە ئایەتی دووەمدا ـ کە توندڕەویان لە ستەمکاریدا بریتیبوو لە پەرستنی (وەد، سواع، یەغوث، یەعوق، نەسر) لەجیاتی خوداپەرستی.

---

(٢٦١)یونس: ١٠٦ { هاناو هاواریش نەبەیت بۆ کەسێک یان شتێک لە جیاتی خوا، کە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت نە زیان (چونکە قازانج و زیان هەر بەدەست خوایە)، خۆ ئەگەر کاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ستەمکارانیت}

(٢٦٢) النجم : ٥٢ { زووتریش قەومی نوحی لەناو برد کەبێگومان ئەوانیش ستەمکارو سەرکەشتر بوون}

## شێوازی چل و دوو( ٤٢ )ـ:

### گەورەترین گومڕایی پاڕانەوەیە لە بێجگە لە خودا

### ( أعظم الضلال دعاء غير الله )

(١) ﴿وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ ۝٦﴾(٢٦٣) .

(٢) ﴿يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ۝١٢ يَدۡعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ ۝١٣﴾(٢٦٤)

---

(٢٦٣) الأحقاف: ٥ - ٦ .{جا ئیتر کێ لەو کەسە گومڕاترە کە دوعاو نزا و پاڕانەوە، ڕوو بەکەسێک یان شتێک دەکات، جگە لەخوا کە ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتیش لێی بپاڕێتەوە بێ سوودە، نەبەهانایەوە دەچێت، نەبەپەرستنەکەش دەزانێت، لەکاتێکدا ئەوانەلەدۆعاو پارانەوەی ئەوان بێ ئاگاو غافڵن و هەستی پێ ناکەن *کاتێکیش کەخەڵکی کۆدەکرێنەوە بۆ لێ پرسینەوە، بت و پەرستراوەکان دەبنە دوژمن بۆ ئەو کەسانەکە لەدونیادا دەیانپەرستن، بەهیچ شێوەیەک بڕوایان پێ ناکەن، بەڵکو بەدرۆیان دەخەنەوە.} .

(٢٦٤) الحج: ١٢ - ١٣ . { (ئەو جۆرە کەسانە) هاناو هاوار لەکەسێك دەکەن لەجیاتی خوا، یاخود پەنا بۆ کەسێك دەبەن نە زەرەرو نە قازانجی پێدەگەیەنێت، ئەو حاڵەتە گومڕایی و سەرلێشێواویەکی زۆر نابەجێ و دوورە. * (نەفامان هاناو هاوار) لەکەسێك دەکەن کە زەرەری زیاتر و نزیکترە لە قازانجی، ئای کە چەندە یارو یاوەر و هاودەمێکی ناڕەسەن و خراپیان هەیە.}.

(٣) ﴿ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ۝٢٣ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ۝٢٤﴾ (٢٦٥) .

لەبەر ئەوەی بە پاڕانەوە لە خودای پەروەردگار مرۆڤ خۆی دەدۆزێتەوە، بۆیە گەورەترین گومڕابوون لە دونیاو قیامەتدا پاڕانەوەیە لە بێجگەلە خودا.

---

(٢٦٥) یس: ٢٢ - ٢٣ . {ئایا ڕەوایە لە جیاتی خوا چەند پەرستراوێکی تر بۆ خۆم بڕیار بدەم کە هیچیان بەدەست نیە خۆ ئەگەر خوای میهرەبان بیەوێت تووشی ناخۆشیەکەم بکات، تکاو پاڕانەوەی ئەو پەرستراوانە هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنن و فریام ناکەون و ڕزگارم ناکەن * بێگومان من ئەگەر شتی وا بکەم، ئەو کاتە من لە گومڕاییەکی ئاشکرا دەبم.}

## شێوازی چل و سـ( ٤٣ )ـێ:

### نمونە هێنانەوە لە سەر ناژیری ئەو کەسەی دوعا لە بێجگە لە خودا دەکات

### ( ضرب الأمثال على غباء و جهل الداعي من غير الله )

(١) ﴿لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ﴾ (٢٦٦) .

(٢) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾(٢٦٧) .

---

(٢٦٦) الرعد: ١٤. {هەر بۆ خوایە بانگەوازی حەق و ڕاستی، (بەڵام) ئەوانەی هاناو هاوار بۆ کەسێکی تر دەبەن جگە لەو زاتە، هاوار لێکراوان بە هیچ شێوەیەك بەهاناپانەوە نایەن و وەڵامیان نادەنەوە، مەگەر وەکو کەسێك (تینووی بێت لە دوورەوە) دەستەکانی درێژە بکات بۆ ئاو تا بیگەیەنێتە دەمی، کەچی بێسوودەو ناگاتە دەمی، بێگومان دوعا نزای بێ باوەڕان تەنها لەناو تاریکی و گومڕاییدایە و هیچی تر نی یە}

(٢٦٧) الحج: ٧٣.{ ئەی خەڵکینە: نموونەیەك هێنراوەتەوە چاك گوێی بۆ بگرن؛ بەڕاستی ئەوانەی کە هاناو هاواریان لێدەکەن لەجیاتی خوا، هەرگیز ناتوانن تاکە مێشێك دروست بکەن، هەرچەندە بۆ ئەو کارە کۆببنەوە و (یارمەتی یەکتریش بدەن)





(٣) ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ
بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ
يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ (٢٦٨) .

نمونە هێنانەوە لەسەر ناژیری ئەوکەسەی دوعا لە بێجگەلە خودا دەکات لە قورئانی پیرۆزدا، بەڵگەی گەورەیی تاوانەکەیە و ئاگادارکردنەوەیە بۆ گەورەیی تاوانەکە.

---

و ئەگەر مێشەکە شتێکیان لێ بفڕێنێت، ناتوانن لێی بسەننەوە، داواکارو داوالێکراو هەردووکیان لاواز و بێ دەسەڵاتن.}.

(٢٦٨) العنكبوت : ٤١ - ٤٢.{ نمونەی ئەوانەی جگە لە خوای گەورە، کەسانێکی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان، وەك نمونەی جاڵجاڵۆکەیەك وایە کە ماڵێکی بۆخۆی سازکردبێت بەڕاستی لاوازترینی هەموو ماڵەکان، ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر سەرنجیان بدایە و تێبگەیشتنایە ( چونکە ماڵی جاڵجاڵۆکە نە بناغە و نە دیواری هەیە، نە سەرو دەرگا و پەنجەرە، نە دەتوانێت بەرگەی با و باران و ڕوداوەکان بگرێت مێیەکەش نێرەکە لە ناو دەبات دوای جووت بوون، پاشان بێچوەکانیش دایکیان لە ناو دەبەن ) !!! * بێگومان خوا خۆی چاکدەزانێت ئەوەی ئەو خەڵکە هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو، چەندە بێ دەسەڵاتن، چونکە هەر خۆی خواوەن دەسەڵاتە و زۆریش دانایە ( لەو بوارەی کە بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکی ڕەخساندویەتی ) . }.

## شێوازی چل و چـ( ٤٤ )ـوار:

### نمونە هێنانەوە لە سەر بێ وەفایی ئەو کەسانەی کە دوعا لە بێجگە لە خودا دەکەن

### ( ضرب الأمثال على غدر و ختر الداعي من غير الله و عدم وفائه )

(١) ﴿فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ إِذَا هُمۡ يُشۡرِكُونَ﴾(٢٦٩)

(٢) ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوۡجٞ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ فَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٖ كَفُورٖ﴾(٢٧٠)

---

(٢٦٩) العنكبوت: ٦٥. {هەر کاتێک خەڵکی (باوەڕ لاواز) سواری کەشتی دەبن، مەترسی نوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات، زۆر بەکوڵ، هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن و بە دڵسۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام کاتێک خوا ڕزگاریان دەکات و دەگەنەوە وشکانی دەستبەجێ لە ڕێبازی یەکتاپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن.}.

(٢٧٠) لقمان: ٣٢. {کاتێکیش لە دەریادا شەپۆلێک ئابڵوقەی هاوەڵگەرو کارەکان بدات، وەک کێوەکان گەورە بێت، ئەوە هاناو هاوار هەر بۆ خوا دەبەن زۆر بە دڵسۆزانە ملکەچن بۆ خوا، جا کاتێک فریایان دەکەوێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانگەیەنێتە وشکانی، جا هەیانە بەردەوام دەبێت لە سەر ڕێبازی ئیمان و دەمێنێتەوە لەسەر یەکتاناسینی خوای میهرەبان، (هەشیانە ڕێگەی نادروستی خۆی دەگرێتەوە)، جا کەس لە ئایات و بەڵگەکانی ئێمە نکوڵ و پەیمان شکێنی ناکات جگە لە زۆردار و ناپاک و سپلە.}.

(٣) ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾(٢٧١) .

(٤) ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾(٢٧٢) .

(٥) ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ ۙ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ

---

(٢٧١) يونس : ١٢. {کاتێکیش ئادەمیزاد (ئەوانەیان کەباوەڕ لەدەروونیاندا بەچاکی دانەمەزراوە) زیان و ناخۆشیەکی تووش بێت، ئەوە هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنێت بۆ لابردنی، لەکاتی ڕاکشاندا، یان بەدانیشتنەوە، یان بەپێوەبێت، جا کاتێک زەرەر و زیانەکەی لێ دوور دەخەینەوەو دەکەوێتەوە باری ئاسایی، هەروا دەڕوات بەڕێدا و بارودۆخی ئەوسای فەرامۆش دەکات، هەروەک ڕۆژێ لەڕۆژان هاواری لە ئێمە نەکردبێت و ل ەئێمە نەپاڕابێتەوە تا ناخۆشی و زیانێک کەتووشیبووە لێی دوور بخەینەوە، ئا بەو شێوەیە بۆ لەسنوور دەرچووان ئەو کارو کردەوانەی کەدەیانکرد ڕازێنراوەتەوە. } .

(٢٧٢) الزمر : ٤٩. {جا کاتێک ناخۆشی و ئازارێک تووشی ئینسان بێت، هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنێت و ئەگەر نازو نیعمەتێکمان پێبەخشی؛ دەڵێت؛ ئەمە تەنها شارەزایی خۆمە، زیرەکی خۆمە، لێهاتوویی خۆمە، نەخێر وا نیە؛ ئەو بەخشینە بۆ تاقی کردنەوەیە، بەڵام زۆربەیان بەم ڕاستیە نازانن}.





أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ (٢٧٣) .

بێ وەفایی بەرامبەر مەخلوق لە فیترەتی هەموو مرۆڤێکدا شەرمەزارییە، لەم ئایەتانەدا پەروەردگار باسی بێ وەفایی مرۆڤ دەکات بەرامبەر خالق، کە دەبێ چ شەرمەزارییەك بێت لە قیامەتدا!

دیمەنی بێ وەفایەکەش ـ کە لە زیاتر لە ئایەتێکدا دووبارە دەکرێتەوە ـ، لەبیرکردنی مرۆڤە بۆ کاتەکانی تەنگانە، کە پاش پاڕانەوەیەکی زۆر لەم کاتانەدا تەنها خودا بەهانایەوە هاتووە ڕزگاری کردووە و پاش ڕزگاربوونی خودای لە بیرکردووە.

---

(٢٧٣) یونس:٢٢ - ٢٣ {(ئەی هاوەڵگەڕان) خوا ئەو زاتەیە کە لەوشکانی و دەریادا هاتو چۆتان پێدەکات، هەتا ئەو کاتەی کە لەکەشتیەکاندا دەبن و دەیانگوێزنەوە بەهۆی باو شەماڵێکی پاک و ئارامەوەو هەمووان دڵخۆشن پێی، ئەوە بایەکی توندو بەهێز و سەخت بەرەو کەشتیەکە بێت و هەڵبکات،لەهەموو لایەکەوە شەپۆل بۆیان بێت، ئیتر وابزانن کە دەورەدراون و (ڕزگار بوونیان ئەستەمە، ئا لەو کاتەدا خەڵکەکە بەسۆزەوە) هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن، دڵنیان خوا نەبێت کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت، لەکاتێکدا بیرو باوەڕو ئاینیان بەتەواویی پاک و پوخت و یەکلایی دەکەنەوە بۆ خوا، بۆیە بەسۆزەوە دەڵێن: سوێند بەخوا ئەگەر لەم بەڵایە، لەم تەنگانەیە، ڕزگارمان بکەیت، ئەوە بەڕاستی دەچینە ڕیزی سوپاسگوزارانتەوە* جاکاتێک خوا ڕزگاری کردن، خێرا ئەوان بەناحەق دەست دەکەنەوە بەستەمکاری لەزەویدا، ئەی خەڵکینە: بەڕاستی ستەم کردنتان تەنها لەسەر خۆتان دەکەوێت و بەزیانی خۆتان تەواو دەبێت، ئێوە بەو ستەمکاریە خۆشی و ڕابواردنی ژیانی دنیاتان دەوێت، لەوەودوا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای ئێمەیەو ئەوسا ئاگادارتان دەکەینەوە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کەدەتانکرد.}.




## شێوازی چل و پێنـ( ٤٥ )ـج :

### لە قورئانی پیرۆزدا دوعاکردن لە بێجگە لە خودا، سووکی و بێ بەهایی کەسایەتی دوعاکارە

### ( دعاء غير الله من هوان الداعي على الله )

(١) ﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾(٢٧٤)

(٢) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ۖ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۗ قُلِ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ﴾(٢٧٥) .

---

(٢٧٤)الفرقان :٧٧. {تۆ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ: (خەڵکینە پەروەردگارم هیچ گوێتان پێ نادات و نرختان بۆ دانانێت، ئەگەر دوعاو نزاو خواپەرستیتان نەبێت، کەچی زۆربەتان هەر پێغەمبەر و قورئانتان بە درۆزانی، ئەگەر بەردەوام وابن، ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لە ئایندەدا یەخەتان پێ دەگرێت لە کۆڵتان نابێتەوە.} .

(٢٧٥) الأعراف: ١٩٤.{بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان لێدەکەن جگەلە خواو لێیان دەپاڕێنەوە، چەند بەندەیەکی وەک ئێوەن (هیچیان بەدەست نیە) دە هاواریان لێ بکەن، بابێن بەدەمتانەوە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (لەو داوایەتاندا). * ئایا ئەو پەرستراوانە قاچیان هەیە پێی بڕۆن بەڕێوە؟ یان دەستیان هەیە ڕای بوەشێنن و ئازاری نەیارەکانی پێ بدەن؟ یاخود چاویان هەیە پێی ببینن؟ یاخود گوێیان هەیە پێی





(٣) ﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾﴾(٢٧٦)

لەم ئایەتانەدا پەروەردگار ئاگادارماندەکاتەوە کە بەهای مرۆڤ لە یەکخوداپەرستی دایە، ئەویش پاڕانەوەیە تەنها لەخودا، لەدەستدانی ئەم بیروباوەڕە مانای لەدەستدانی نرخی مرۆڤایەتی مرۆڤە!

---

ببیستن؟ ئەی محمد(صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: داوا لە پەرستراوەکانتان بکەن و چیتان لە دەست دێت لە پیلان گێڕان بیکەن و مۆڵەتم مەدەن...}.

(٢٧٦) الصافات: ١٢٣ - ١٢٥ { بێگومان - ئیلیاس - یش لە دەستەی پێغەمبەران و ڕەوانە کراوانە (لە لایەن ئێمەوە). * ئەوکاتە ئەویش بە قەوم و گەلەکەی خۆی وت: ئەوە ناکرێت خواناس بن؟ ئەوە بۆ لەخوا ناترسن؟! *.ئایا ئێوە هاناو هاوار و نزا بۆ ـ بەعل ـ دەبەن (بتێکی گەورە بوو دەیانپەرست) و واز لە خوداپەرستی دەهێنن لە کاتێکدا ئەو زاتە چاکترینی دروستکارەکانە.* کە - الله - یە، پەروەردگارتانە، پەروەردگاری باو و باپیرانی دێرینیشتانە (ئەوە بۆ بیرێک ناکەنەوە)؟!} .

## شێوازی چل و شەش( ٤٦ )ـ:

### پاش و پێشی ئایەتەکانی باسی دوعاکردن ئاماژەن کە بانگەوازی پێغەمبەران بانگەوازە بۆ تەنها پاڕانەوە لە خودا

### ( دلالة سياق الآيات على أن رسالة الرسل هو في إفراد الله بالدعاء )

| | ئایەتی باسی بانگەواز بۆ یەکخوداپەرستی | ئایەتی باسی دوعاکردن | ئایەتی باسی بانگەواز بۆ یەکخوداپەرستی |
|---|---|---|---|
| **سورة يونس**<br>(هاتنی ئایەتی باسی بانگەواز پاش دوو ئایەت لە باسی پاڕانەوە تەنها لە خودا). | ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي شَكّٖ مِّن دِينِي فَلَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنۡ أَعۡبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُمۡۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠٤ ...﴾ | ﴿وَلَا تَدۡعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَۖ فَإِن فَعَلۡتَ فَإِنَّكَ إِذٗا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠٦ ....﴾ | ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ ١٠٨﴾ |
| | ئەی (محمد) پێیان بفەرموو ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لەم پەیامە کە دینی ئیسلامە و یەکخوداپەرستییە ئەوا من دەستی پێوەدەگرم و تەنها بەندایەتی بۆ ئەو خودایە دەکەم کە دەتان مرێنێت، ... | ئەی (محمد) هاناو هاوار نەبەی بۆ کەسێك یان شتێك ـ بێجگە لە خودا ـ کە نەقازانجت پێدەگەیەنێت نە زیان، ئەگەر کاری وەها ئەنجام بدەیت، ئەوا ستەمکاری. | ئەی(محمد) بە خەڵك ڕابگەێنە کە پەیامی حەق و ڕاستی لە خودایەوە بۆتان هاتووە، ئەوەی دەست بەم پەیامەوە بگرێت ئەوا خۆی قازانج دەکات و دەباتەوە، ئەوەی گومڕاوی هەڵدەبژێرێت و پشت تێدەکات، ئەوا زەرەر و دۆڕاندنەکە بۆ دەگەڕێتەوە، من لێپسراو و چاودێر نیم لە سەر ئێوە. |





❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

| | ئایەتی باسی دوعاکردن | ئایەتی باسی بانگەواز بۆ یەکخوداپەرستی | ئایەتی باسی دوعاکردن |
|---|---|---|---|
| **سورة الجن**<br>(هاتنی ئایەتی بانگەواز بۆ خودا لە نێوان دوو ئایەتی باسی دوعاکردن و پاڕانەوە تەنها لە خودا). | ﴿وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ١٨﴾ | ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ١٩﴾ | ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا ٢٠﴾ |
| | ئایەتەکە باسی ئەوە دەکات کە مزگەوتەکان تەنها هی خودان و پێویستە تەنها خودا بپەرسترێت، مرۆڤ تەنها لە ئەو بپاڕێتەوە. | ئایەتەکە باسی بانگەوازی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) دەکات بۆ (جن). | ئایەتەکە باسی ناوەڕۆکی بانگەوازەکەیە، کە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بە شێوازی خەبەر فەرمانیان پێدەکات کە تەنها لە خودا بپاڕێنەوە. |

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

| | ئایەتی باسی دوعاکردن | ئایەتی باسی بانگەواز |
|---|---|---|
| **سورة الشعراء**<br>(هاتنی یەکەم ئایەتی بانگەواز پاش باسکردن لە تایبەتکردنی پاڕانەوە تەنها لەخودا). | ﴿فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ٢١٣﴾ | ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤﴾ |
| | ئەی (محمد) نەکەی هاناو هاوار بۆ بێجگە لە خودا ببەی تووشی سزا دەبیت. | ئەی (محمد) یەکەم جار عەشیرەتەکەت و نزیکەکانت لە سزای خودا ئاگاداربکەوروەوە. |

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

| | دوو ئایەتی باسی دوعاکردن | ئایەتی باسی بانگەواز |
|---|---|---|
| **سورة الأنعام**<br>(هاتنی ئایەتی باسی بانگەواز پاش دوو ئایەت لە باسی پارانەوە تەنها لە خودا) | ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتَكُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوۡ أَتَتۡكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَدۡعُونَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (40) بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ (41)﴾ | ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَتَضَرَّعُونَ (42)﴾ |
| | ئەی(محمد) پێیان بفەرموو: ئەگەر سزای خودا بۆتان هات و قیامەت هات، پێم بڵێن ئێوە هاناو هاوار بۆ کێ دەبەن؟ و ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن پێم بڵێن کەسی دیکە بێجگە لە خودا بە هاناتانەوە دێت؟ ئەوکات تەنها هاوار بۆ خودا دەبەن و تەنها خوداش بە هاناتانەوە دێت، ئەو کەسانەی هاوارتان بۆ دەبردن دەتانکردنە شەریك بۆ خودا لە بیردەکەن. | ئێمە بۆ ئومەتی پێش ئەم ئومەتەش پێغەمبەرمان ناردوون و خەڵکانمان تووشی بەلاو نەهامەتی کردوون، تاوەکو بە پیل بانگەوازی پێغەمبەرانەوە بێن لێمان بپاڕێنەوە. |
| ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ | | |

بە بیرکردنەوە لە ڕێزبەندی بابەتەکان دەبینین باسی بانگەوازی پێغەمبەران (علیهم السلام)و باسی دوعا و پاڕانەوە تەنها لەخودا لە قورئانی پیرۆزدا پێکەوە دێن، ئەمەش ئاگادارکردنەوەی موسڵمانی بانگخوازە کە بانگەواز بۆ ئیسلام، بانگەوازە بۆ دروستکردنی پەیوەندی مەخلوق بە خالقەکەی بە زۆری پاڕانەوە.

## شێوازی چل و حەفت(٤٧):

### پاش و پێشی ئایەتەکانی باسی دوعاکردن

### قوتابخانەی فێرکردنی دوعاکردنن لە خودای پەروەردگار

**(دلالة سياق آيات الدعاء معالم و مدارس في الدعاء من الله دون غيره)**

ئەمەش بەچەند نمونەیەك دەخەینەڕوو لە دوو خشتەدا بۆ نزیککردنەوەی ماناکان:

یەکەم: سیاقی ئایەتی فەرمانکردن بە دوعاکردن لە سورەتی غافر ئاماژەیە کە دوعا خاڵی ڕزگاربوونە و تەنها خودا وەڵامی دوعاکار دەداتەوە.

| پێش ئایەتی<br>فەرمان بە دوعاکردن | ئایەتەکە | پاش ئایەتی<br>فەرمان بە دوعاکردن |
|---|---|---|
| ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٌ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ٥٩﴾ | ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ٦٠﴾ | ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٦١﴾ |
| هاتنی قیامەت ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە، بەڵام خەڵك لێی بێئاگان و ئیمان ناهێنن. (ئایەتەکە وەکو پێشەکییەکە کە لە پاشیدا باسی هۆکاری ڕزگاربوون لە قیامەتدا دەکرێت کە پاڕانەوەیە لە خودا) | پەروەردگار فەرمان دەکات لێی بپاڕێنەوە ئەوانەی تەکەبوردەکەن لە بە جێگەیاندنی ئەم فەرمانە جێگایان دۆزەخە. | خودا باسی گەورەی خۆی دەکات کە شەو ڕۆژی بۆ مرۆڤ موسەخەرکردووە شەو بە تاریکی بۆ پشودان و ڕۆژیش بە ڕووناکی بۆ کارکردن و شوکرانە، سەرەڕای ئەمەش زۆرینەی خەڵك شوکرانە ناکەن. (ئەمەش ئاماژەیەکە کە تەنها ئەم خودا باڵادەستە کە شەو و ڕۆژی موسەخەر کردووە، وەڵامی دوعاکار دەداتەوە). |





دووەم: سیاقی ئایەتی باسی دوعاکردن لە سورەتی فاطر، ئاماژەیە کە تەنها خاوەن موڵکی ڕەها وەلامی دوعا دەداتەوە کە خالقە، دەوڵەمەندی ئەم خالقە پێویست دەکات هەموو مەخلوقێك هەژاری بۆی بنوێنێت و لێی بپاڕێتەوە.

| پێش باسی دوعاکرد | ئایەتی باسی دوعا | پاش باسی دوعاکردن |
|---|---|---|
| ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۚ﴾ | ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ ١٣ إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثۡلُ خَبِيرٖ ١٤﴾ | ﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ١٥﴾ |
| ئایەتەکە باسی باڵادەستی خودایە کە خاوەن موڵك و هەڵسوڕێنەری شەو و ڕۆژە بۆ کاتی دیاریکراو. (ئەمەش پێشەکییەکە بۆ ئاگادارکردنەوە کە مرۆڤ تەنها لەم خودا باڵادەستە بپاڕێتەوە). | ئایەتەکە باسی بێ دەستەڵاتی و نەداری نابیسەری پەرستراوەکانی موشریکەکان دەکات، کە هیچیان بەدەست نییە. | ئایەتەکە باسی حاڵی خەڵك دەکات بەرامبەر خودا، کە چۆن دەوڵەمەندی ڕەهای خالق هەژاری بەسەر مەخلوقدا دەسەپێنێت و ملکەچی دەکات بۆ پاڕانەوە. |

## شێوازی چل و هەشتـ( ٤٨ )ـ:

### بە پێی سیاقی ئەو ئایەتانەی باسی چاکەکاری دەکەن، دوعاکردن مەرجە بۆ قەبوول بوونی چاکەکاری

### ( یشترط لقبول العمل الصالح الإفتقار إلی الله ودعاءه )

ئەمە شێوازی پێش کۆتایی بابەتەکەمانە کە لە هەموو شێوازەکانی دیکە بەربلاوترە لە قورئانی پیرۆزدا، یەکێکە لە خاڵە هەرە گرنگەکانی جوان تەدەبر و جوان تێگەیشتن و جوان کارپێکردنی قورئانی پیرۆز، کە باسکردنی قورئانی پیرۆزە بۆ زیکرو دوعاکردن و پاڕانەوە پاش باسکردنی هەموو جۆرە چاکەکارییەك، بەم سیاقە قورئانی پیرۆز پێمان ڕادەگەیەنێت کە هەبوونی دوعا مەرجە لە قەبوولبوونی گشت جۆرە چاکەکاریەك، ئەمەش خۆی لەخۆیدا گەورەترین خاڵی بانگەوازە بۆ بیرۆباوەڕی یەکخوداپەرستی (توحید)، لەم شێوازەدا لەسەر چەند نمونەیەك دەوەستین و بە شێوەی خشتەکاری نزیکی دەکەینەوە:

| چاکەکاری (العمل الصالح) | ئایەتەکانی باسی چاکەکارییەکە | باسی دوعا و پاڕانەوە پاش باسی چاکەکارییەکە |
|---|---|---|
| چاکەی: دانپێدانان بە گەورەیی ناو و سیفەتەکانی خودا و ملکەچبوونی بەندە بۆ خوداپەرستی (تعظیم الخالق و الإقرار له بالعبودیة) | ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝٤ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥ | ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ (الحمد) |
| ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ | ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ | ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ |





| | | |
|---|---|---|
| چاکەی: سوپاسگوزاری (الحمد) | ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ | رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾﴾ (إبراهيم) |
| چاکەی: تەسلیم بوون بۆ ئەمرو نەهیەکانی خودا لە ئایەتە موحکەمەکان و موتەشابیهەکان (التسليم لأمر الله) | ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٧﴾﴾ | ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٩﴾﴾ (آل عمران) |
| چاکەی: ئەرکانی ئیمان (أركان الإيمان) | ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ — | وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾﴾ (البقرة) |
| ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ | ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ | ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ |





| | | |
|---|---|---|
| چاکەی: یادکردنەوە لە گەورەیی خودا بە بیرکردنەوە لە گەورەیی زەوی و ئاسمانان و دانانان بە حیکمەتی خەلقکردنیان، کە ئیمتیحانی بەندەیە و سزاوپاداشتی لەپاڵە... **(التفكر في ما خلقه الله وما وراء ذلك من حكمته الباهرة و ثوابه وعقابه).** | ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾﴾ | ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾ (آل عمران) |
| ❊❊❊❊❊ | ❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊ | ❊❊❊❊❊❊❊❊ |

